زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەڵقەی پێنجەم

عەلی باپیر

# سیاسەتی ئیسلامی و چەند ڕوونکردنەوەیەک





**زنجیرەی بابەتە هەنووکەیی‌یەکان**
**ئەڵقەی:**

# سیاسەتی ئیسلامیی
# و
# چەند ڕوونکردنەوەیەک

علی باپیر

1427 ک
2007ز




بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

ناوی کتێـــب: سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەک
نوســـەر: عـەلی باپـیر
بـڵاوکردنەوەی: نوسـینگەی تەفسـیر بۆ بڵاوکردنەوەو راگەیاندن هـەولێـر
خـــە ت: نەوزاد کـۆیی
بـــەرگ : أمیـن مخـلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم 1428ك – 2007ز
تـــیراژ: 3000 دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (      ) ی ساڵی 2006 دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿...أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ؟! مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلاَّ أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (يوسف-39، 40)

واتە:

﴿.. ئایا چەند پەروەردگارێکی پەرتەوازە چاکترن یاخود خوای تاکی مل پێکەچکەر؟! بێگومان ئێوە جگە لە هەندێك ناو کە خۆتان و باب و باپیرانتان ناوتان ناون و خوا هیچ بەڵگەی لە سەر نەناردوو نەخوارێ، چیدیکە ناپەرستن. حوکمڕانیی تەنیا هی خوایە، فەرمانی کردوە کە جگە لەوی نەپەرستن، ئائەوەیە ئاینی ڕاست بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.﴾

# پێشکەش بێ:

بەوانەی کە بەهۆی چاك تێگەیشتنی قورئانەوە دەزانن کە ئیسلام وەك چۆن هیدایەتە بۆ ئینسان بەرنامەیەکی رێکخەریشە بۆ ژیان و گوزەران، وە دڵنیان کە ئیسلام بەبێ دەسەڵات و قەوارەی سیاسی وەك پێویست بەرێوەنابرێ و لە پێناوی باڵادەست کردنیدا درێغی ناکەن لە هەرچی پێیان بکرێ.

# پێشـــەکی:

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الله محمد المبعوث رحمة للعالمين واله أجمعين من الصحب والقرابة والازواج والتابعين لهم بأحسان الى يوم الدين.

خوێنەری بەڕێز:

ئەم نامیلکەیەی بەردەستت لە دوو بەش پێکهاتوە:

بەشی یەکەم حەوت کورتەباسی جۆراوجۆرە کە لە سووڕگەی شەریعەت و سیاسەتدا دەسووڕێنەوەو لەم ڕۆژانەدا نوسیمن کە باسوخواسی دەستوور پرۆژەی دەستووری کوردستان گەرم و گوڕە.

بەشی دووەمیش بریتیە لە وتارێك کە ڕۆژی (2005/8/20) لە ئێوارە کۆڕێکدا لە شارۆچکەی دەربەندیخان لە هۆڵی ئەحمەدموختار بەگ دراوەو پاش هێنرانە سەر کاغەزی(1) و چاو پیێداگێڕانەوەی خۆم بەوجۆرەی لێهاتوە کە دەیبینن. هیوا داریشم ئەم نامیلکەیە کەلێنێکی باش بگرێ،

(1) لە لا یەن برای بەڕێزو خۆشەویستمەوە کاك (مەلا بیلال قەڵادزەیی) یەوە خوا بە چاکترین شێوە پاداشتی بداتەوە.
شایانی باسیشە کە (محمد) ی کوڕم هەڵساوە بە تایپ کردنی ئەم نامیلکەیە بە هەردوو بەشەکەیەوە خوا صالح و سەلامەتی بکات.

هەتا خوا یاربێ دەرفەتی لێکۆڵینەوەیەکی خەست و خۆڵم لە بارەی حوکم و سیاسەتەوە لە ئیسلامدا بۆ دەڕەخسێ لە کتێبێکی سەربەخۆدا. خواش بەکەرەم و لوتفی بێسنووری خۆی هیدایەتی چاکترمان بدات کە هەرچی دەیلێین و دەیکەین ساغی و ڕاستی (الإخلاص والإصابة)ی زیاتری تێدابێت و لە خلتەوخاڵ و هەڵەوپەڵە دوورتربێت.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين
والحمدلله رب العالمين.

1427/10/11
2006/11/2
هەولێر








# بەشی یەکـــەم:

# حـەوت کورتە باس دەربارەی پەیوەندی نێوان شــەریعەت و ســیاســەت

# ڕێ خۆشکردن

خوێنەری سەنگین!

ئەم بەشی یەکەمە ئەم حەوت بابەتەی گرتوونەخۆی:

1- نەگونجانی لەیەك دابڕانی شەریعەت و سیاسەت.
2- بناغەی بیرۆکەی لەیەك دابڕینی شەریعەت و سیاسەت لەلایەن عەلمانییەکانی نێو جیهانی ئیسلامییەوە بریتیە لە: قیاس کردنی ئیسلام لەسەر نەصرانیەت.
3- دیاری نەکردنی چۆنیەتی و میکانیزمی وردی دەوڵەتداری و حوکمڕانیی لە ئیسلامدا حیکمەتی گەورەی تێدایە.
4- پابەندبوونی حکومەت بەشەریعەتەوە سەرناکێشێ بۆ وشکی(جمود) چونکە ئەسڵ لە مامەڵەکان (المعملات)دا ڕەوایی و دەست کراوەییە.
5- دەستوور و یاسای دەوڵەتێکی مسوڵمان پێویستە تا کە سەر چاوەی شەریعەت بێ.
6- چوار تایبەتمەندی گرنگی ئیسلام لەبواری حوکم و سیاسەتدا.
7- ڕوونکردنەوەی ڕاستییەك و ڕاستکردنەوەی هەڵەیەك.

ئێستاش تۆو ئەو شەش کورتە باسە یەك لەدوای یەك:

## ( 1 ) نەگونجانى لەيەك دابرِانى شەريعەت و سياسەت

خوێنـــەرى بەرِێز!

دەتوانين زۆر جۆرە بەڵگان لەسەر سەلماندنى ئەو رِاستييە بێنينەوە كە لە رِاستى‌دا بۆ هەركەسێك بە ئەلف بێى ئيسلام ئاشنابێت و شتێك لە سەرەتايەكانى قورئان و سوننەت بزانێ ئەو مەسەلەيەى لا شتێكى ئاشكراو بەڵگە نەويستە، جا ئێمە لێرەدا بە كورتى ئاماژە بە چوار جۆر لەو بەڵگانە دەكەين و شايانى باسيشە كە ئێمە لە كتێبى: (ئيسلام و مسوڵمانەتيى و كارى ئيسلاميى لەژێر رِۆشنايى قورئان و سوننەتدا)دا تا رِاددەيەكى باش ئەو بابەتەمان تويژيوەتەوە لەزۆر لاوە تيشكمان خستۆتە سەرى، چونكە بەداخەوە ئەو مەسەلەيەش وەك گەلێك بابەتى ديكەى گرنگى ئيسلام و مسوڵمانەتيى ژمارەيەكى زۆرى مسوڵمانان تێيدا دووچارى چەواشەبوون بوون و تەوژمى سيكۆلاريزميش سوودێكى خراپى لەو بێئاگايى و چەواشەكرانەى مسوڵمانان بينيوە و لەو درزەوە لێيان هاتۆتە ژوورێ و زەفەرى بە ژمارەيەكيان بردوە!

چونكە بێگومان هەركات مسوڵمانان بەهەڵە واتێگەيشتن كە دينەكەيان وەك دينى مەسيحى گۆرِراو حەقى بەسەر حوكم و سياسەتەوە نيەو دەڵێ: ئەوەى هى قەيسەرە بۆ قەيسەرى لـێ‌گەرِێ و ئەوەى هى

خواشه بۆ خوا ((دع ما لقیصر لقیصر و ما لله لله)) ئەوە مەیدانی مشوورخواردن لە کۆمەڵگا لە بوارەکانی سیاسەت و ئابووری و کۆمەلایەتی و جەنگ و ئاشتیدا چۆڵ دەکەن و ئەو کاتەش خەڵك و وڵات بەدەست دنیا خۆرە خوانەناسەکان و طاغووتە خۆ سەپێن و خۆشگوزەرانەکانەوە گیرۆدەخۆن و پەندی: (بەزی بە کتکی دەسپێرن)یان بەسەردا دەچەسپێ!

ئێستاش بابێینە سەر باسی ئەو چوار جۆرە بەڵگانەی ئاماژەمان پێیاندا:

## 1- دەقەکانی قورئان و سوننەت:

لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا تێکهەڵکێشی شەریعەت و سیاسەت شتێکی یەکجار ڕوونەو دەتوانین لەو بارەوە چەندان ئایەت و فەرموودە بە نموونە بێنینەوە، کە ئەمانە هەندێکیانن:

1- ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا﴾ (النساء -105)

واتە: ئێمە کتێبمان بە حەقەوە بۆ تۆ ناردۆتە خوارێ تاکو بەو جۆرەی کە خوا پیشانی داوی دادوەریی لە نێوان خەڵکی دا بکەی وە مشتومڕ لەسەر ناپاکان مەکە!

2- ﴿ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (يوسف -40)

واتە: حوكم تەنیا هی خوایە فەرمانی كردوە كە جگە لەوی هیچ كەس و هیچ شتێك نەپەرستن، ئا ئەوەیە دینی ڕاست بەڵام زۆر بەی خەڵكی نازانن.

3- ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (التوبة -103)

واتە: لە ماڵ و سامانیان ئەی موحەممەد- زەكاتێك وەربگرە كە بەهۆیەوە پاكیان بكەیەوە و تەزكیەیان بكەی، وە دووعایان بۆ بكە چونكە دووعای تۆ مایەی ئارامییە بۆیان، وە خوا بیسەرو زانایە.

4-﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ...﴾ (الأنفال -65)

واتە: ئەی پێغەمبەر ئیمانداران هانبدە بۆ جەنگ...

وەك دەبینین لەم چوار ئایەتەی سەرەوەدا خوای بەرزو مەزن چوار ڕاستی دەخاتە ڕوو:

یەكەم: خوا كتێبی خۆی بەهەق ناردۆتە خوارێ و پێویستیشە دادوەریی لەنێو خەڵكی دا بە پێی شەریعەتی ڕانوێنراوی خوا بكرێ.

دووەم: بێجگە لە خوا عز وجل هیچكەس مافی ئەوەی نییە حوكم و بەرنامە دانانی بەدەست بێ، وەك چۆن دروست نییە غەیری خوا بپەرسترێ.

سێیەم: پێویستە زەكاتی ماڵی موسوڵمانان لە لایەن دەسەڵاتی شەرعییەوە كۆ بكرێتەوە.

چوارەم: لەسەر دەسەڵاتی شەرعیی مسوڵمانان پێویستە سەرپەرشتی جەنگ و جیهاد بکات.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە:

1- (كانت بني إسرائيل تسوسهم الأنبياء كلما هلك نَبِــيٌّ خلفه نَبِــيٌّ وانّه لا نَبِــيَّ بعدي وستكون خُلَفاءُ فيكثرون...) رواه البخاري.

2- (من أطاعني فقد أطاع الله ومن عصاني فقد عصى الله، ومن أطاع الأمير فقد أطاعني ومن عصى الأمير فقد عصاني) متفق عليه.

3- ( إذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمِّروا أحدهم) رواه أبوداود.

4- (على المرء المسلم السمع والطاعة فيما أحب وكَرِهَ إلاّ أن يؤمر بمعصية، فإذا أمر بمعصية فلا سمع ولا طاعة) رواه البخاري.

وەك دەبینین لەم چوار فەرمایشتەش دا پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ڕاستییەك لە بواری حوكم و سیاسەت دا ڕادەگەیەنێ:

یەكەم: گەلی بەنی ئیسرائیل پێغەمبەران (علیهم السلام) كاروباری سیاسیی و حوكمڕانی یانیان بە ئەستۆوە گرتبوو سەرپەرشتییان دەكردن، بەڵام لە دوای موحەممەد ﷺ هیچ پێغەمبەر نایەن و جێنشینەكانی كاروباری حوكم و سیاسەت ڕادەپەڕێنن.

دووەم: گوێرایەڵی مسوڵمانان بۆ پێغەمبەر ﷺ و كاربەدەستانیان فەرمانبەرییە بۆ خوا (عزّو جل)، بە پێچەوانەشەوە سەرپێچی یان بۆ پێغەمبەرو مشوورخۆرانیان بە سەرپێچی خوا سبحانە وتعالی دادەنرێ.

سێیەم: دروست نیە تەنانەت سێ مسوڵمان ئەگەر لە سەفەریش بن بەرپرس و براگەورەیەكیان نەبێ!
چوارەم: ئینسانی مسوڵمان لەسەری پێویستە لە كاتی پێخۆشبوون و پێناخۆشبووندا فەرمانبەریی براگەورەی خۆی بكات، مادام ئەو فەرمان و ئاراستەیە سەرپێچی و ناشەرعیی نەبێ.
پێشم وایە هەركەسێك سەرنجی ئەم هەشت دەقەی قورئان و سوننەت بدات كە تەنیا چەند نموونەیەكی كەمن- زۆرباش دڵنیا دەبێ كە بە هیچ رەنگێك ناگونجێ حوكم و سیاسەت و سەرپەرشتی كردنی گەل و وڵات لە شەریعەتی خوا دابرنرێ و لە یەك بترازێنرێن لە نێو كۆمەڵگاو خەڵكێكدا كە دەیانەوێ بە مسوڵمانەتی بژین و شەریعەت سایەو سێبەریان بێ!

## 2- سروشتی ئیسلام:

بەڵێ بەرێزان!
سروشتی ئیسلامیش بەڵگەیەكی دیكەیە لەسەر نەگونجانی لە یەك ترازانی (دین)و (ژین) یان (شەریعەت)و (سیاسەت)، چونكە:
یەكەم: ئیسلام بۆ حوكمرانیی و باڵادەستی هاتوەو بۆ رێكخستنی ژیان و گوزەرانی خەڵك و ئاراستەكردنیان هاتوەو، دیارە ئەوەش بەبێ هەبوونی كیان و دەوڵەت و بەدەستەوە گرتنی جڵەوی حوكم و سیاسەت مەیسەر نابێ!

بەڵگەش لەسەر ئەوە کە ئیسلام بۆ ئەوە هاتوە حوکمڕانیی پێ بکرێ و زاڵ و باڵادەست دەبێ زۆرن، بۆ نموونە: ﴿هُوالَّذي أرْسَلَ رَسولهُ بِالهُدى ودينِ الحَقِ لِيُظْهِرَهُ عَلى الدينِ كُلهِ﴾(الفتح -28،التوبة -33، الصف-5)
واتە: خوا ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خۆی بە ڕێنمایی و بەرنامەی ڕاستەوە ڕەوانە کردوە تاکو باڵادەستیی بکات بە سەر تێکڕای بەرنامەکاندا..

**دووەم:** ئیسلام بۆ چەسپاندنی دادگەریی و لابردنی ستەم و زۆر هاتوە و، دیارە ئەوەش بەبێ قەوارەی سیاسیی و دەسەڵات نالوێ، بەڵگەش لەسەر ئەوە کە ئیسلام بۆ چەسپاندنی داد (عدل) و لابردنی ستەم (ظلم) هاتوە زۆرن، بۆ نموونە:

﴿إن اللهَ يأمُرُ بالعَدلِ والأحسان وإيتاءِ ذِي القُربى ويَنهى عَنِ الفَحْشاءِ والمُنكرِ والبَغي يَعِظُكُم لَعلَّكُم تَذَكَّرون﴾ (النحل -90)
واتە: بێگومان خوا فەرمان بە دادگەریی و چاکەکاریی و ماڵ و سامان پێدان بە خزمان دەکات، وە ڕێگریی دەکات لە سنوور شکاندن و تاوان و ستەم و دەستدرێژیی، ئامۆژگاریتان دەکات بەڵکو پەند وەربگرن!

**سێیەم:** ئیسلام لەسەر مسوڵمانانی پێویست کردوە کە فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێگریی لە خراپە بکەن، بەڵکو لەسەری پێویست کردوون کە هەرچی چاکەیە لە هەموو بوارەکانی ژیان و گوزەرانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتی یاندا، بیچەسپێنن و هەر چی خراپە شە

ڕیشەکێشی بکەن و نەیهێڵن، وەك دەفەرموێ: ﴿والمؤمـنُونَ والمؤمِـناتِ بَعْضُهُم أوْلياءُ بَعضٍ يَأمرونَ بِالمَعْروفِ ويَنْهَوْنَ عَنِ المُنكَرِ...﴾ (التوبة –71)
واتە: وە پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار هە ـندێکیان دۆ ست و پ شتیوانی هەندێکیانن فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن..
دەجا هیچ گومانیش لەوەدا نیە کە بەبێ هەبوونی دەسەڵات و قەوارەی سیاسیی پرۆسەی چەسپاندنی چاکەو بنبڕکردنی خراپە جێبەجێ نابێ و وەك پێویست سەرناگرێ.
**چوارەم:** ئیسلام فەرمان بە م سوڵمانان دە کات کە سزا (عقو بە)ی تاوانەکانی:

1- خەڵك بە ناهەق کوشتن، کە: کوشتنەوەیە.
2- ڕێگریی و جەردەیی، کە: کوشتن و هەڵواسین، یان کوشتن، یان دەست و پێی ڕاست و چەپ بڕین، یان دوورخستنەوەیە.
3- داوێن پیسی، کە: سەد قەمچی یە.
4- دزیی، کە: بڕینی دەستی ڕاستە لە مەچەکەوە.
5- بوختان (القذف)، کە: هەشتا قەمچی یە.
6- هاوجینس بازیی (اللواط والسِّحاق)، کە: بریتی یە لە ئازاردان و د یارییکردنی ئە ندازەو چۆنیەتییەکەی شی حەوا ڵەی دە سەڵاتی شەرعیی کراوە.

بەسەر تاوانباران دا بچەسپێ، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:
1- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى﴾ (البقرة –178)

2- ﴿إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ...﴾ (المائدة -33)

3- ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ...﴾ (النور -2)

4- ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا...﴾ (المائدة -38)

5- ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً...﴾ (النور -4)

6- ﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىَ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً، وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾ (النساء -15،16)

دەجا شتێکی ئاشکراشە کە چەسپاندنی هەرکام لەم سزا شەرعی یانە بەسەر کەسانی تاوانباردا کە دەیانەوێ دەستدرێژیی بکەنە سەر:

ژین و ئاسایش و ناموس و سامان و ئابڕووی خەڵك ئەو فیطرەتەی کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، بەبێ هەبوونی کیان دەسەڵاتی سیاسیی مەیسەر نابێ!

## 3- سیرە و ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ:

بەڵێ بەڵگەیەکی دیکەی تێکهەڵکێش بوونی شەریعەت و سیاسەت و دین و ژین لە ئیسلامدا بریتییە لە ژیاننامەی پێغەمبەری خوا

(محمد)ﷺ، دیارە ژیانی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەریش هەمووی بریتی بووە لە پابەندیی بە قورئانەوەو بەندایەتی بۆ خوا کردن بە مانای فراوان و گشتگیری وشەی بەندایەتی وکاتێك سەرنجی ژیانی سەروەری پێغەمبەران و گەورەترین و بەرزترین ئینسان دەدەین، دەبینین:

عەقیدە و شەریعەت و

عیبادەت و سیاسەت و

حوکم و حیکمەت و

پارێزکاریی و فیداکاریی و

مزگەوت وبازاڕ و

دنیا و دوارۆژ و

لەبەر خوا گریان و سوپا پێکەوە نان و

خەڵك تەزکییە کردن و دەوڵەتداریی کردن و

بەکورتی: دینداریی و دنیاداریی، پێکەوە گرێ داون و سەرجەم لایەن و بوارەکانی دین و ژینی ڕەچاو کردوە و هیچ شتێکی بۆ شتێکی دی کە فەرامۆش نەکردوە!

با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بە پێزەی (کلام الله) بدەین:

1- ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ...﴾ (محمد -19)، ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا...﴾ (الجاثية -18)

2- ﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾ (الحجر -99)، ﴿..فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ...﴾ (المائدة -48)

3- ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ...﴾ (النساء – 65)، ﴿... وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ..﴾ (الجمعة –2)

4- ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ...﴾ (الأحزاب –1)، ﴿فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ لاَ تُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ...﴾ (النساء –84)

5- ﴿.. لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ...﴾ (التوبة –108)، ﴿وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ...﴾ (الفرقان– 7)

6- ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ، وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ﴾ (الأنشراح –8،7)

7- ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ ، قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ، نِصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ، أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلا .... وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴾ (المزمل–8،4،3،2،1)، ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ...﴾ (آل عمران –121)

8- ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾، ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ...﴾ (آل عمران –159)

9- ﴿...وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا...﴾ (القصص –77)

بەڵێ هەرکەسێك سەرنجی ئەم ئایەتانە بدات زۆر جوان بۆی دەردەکەوێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن سەرجەم بوارەکانی دینداریی و دنیاداریی پێکەوە گرێ داون و وێکڕاو تێکڕا پێکەوەی کۆکردوونەتەوە!

## 4- واقیعی مێژووی سێزدە سەدەیی دەوڵەتی ئیسلامیی:

بەڵگەیەکی دیکە نەگونجانی لەیەك دابڕانی دین وژین یان شەریعەت و حکوومەت لە ئیسلامدا بریتیە لە مێژووی دوورو درێژی دەوڵەتی ئیسلامیی، چونکە دەبینین کە دەوڵەتی ئیسلامیی هەر لەو ڕۆژەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بناغەی دامەزراندوە لە شاری مەدینە، هەتا ساڵی (1924) کە بەڕەسمی کۆتایی پێ هێنراو لە سەر دەستی کەمال ئەتاتۆرك هەڵوەشێنرایەوەو لە شوێنی وی دەوڵەتێکی عەلمانی ئیعلان کرا، بەڵێ ئەو دەوڵەت و قەوارە ئیسلامییە هەر چەندە کەموکوڕیی و نەخۆشی و دەردی زۆری تێدا پەیدا بوو بوون و لە زۆر ڕووەوە لە قورئان و سونەت دوورکەوتبۆوەو هەر ئەوەش زەمینەی ڕووخێنران و زەفەر پێبرانی لەلایەن دوژمانەوە بۆ خۆش کرد، بەڵام لە هەموو ئەو ماوە درێژەدا کە سێزدە سەدە زیاتر بوو، وە لە هەموو قۆناغەکانی ئەمەوی و عەبباسی و عوسمانیدا کە لادان و نەخۆشیەکان تێیاندا سەریان هەڵدا، مەسەلەی لەیەك دابڕینی شەریعەت و سیاسەت یان دین و ژین، نەك هەر بە کردەوە پراکتیزە نەکرا، بگرە بە تیۆرییش باسێکی جیددی لێوە نەکرا!

له سۆنگەی ئەوەوە كە تێكهەڵكێشرانی شەریعەت و حكومەت و پێكەوە پەیوەست بوون و لەیەك نەترازانیان شتێكی ڕوون و بێ چەندو چوون و مشتومڕ هەڵنەگر بووە!

ئنجا پاشانیش كە دوای ڕووخێنرانی دەوڵەتی عوسمانی بە ساڵێك (علي عبدالرّازق)ی میصری لەو بارەوە كتێبەكەی خۆی: (الأسلام وأصول الحكم)ی نووسی، هەڵوێستەكەی مایەی نیگەرانیی و ڕەخنەو گلەیی تێكڕای زانایانی ئیسلام بوو، وە سەرەنجام هەر بەو هۆیەشەوە لە ڕیزی زانایانی ئەزهەر (علماء الأزهر) وەدەرێ نرا!!

وە لەو كاتەشەوە هەتا ئێستا كتێبەكەی ناوبراو هەر ڕەخنەی لێدەگیرێ بە چاوی گومانایییەوە تەماشای دەكرێ و كتێبی لە سەر دەنووسرێن!

## (2) بناغەی بیرۆکەی لەیەك دابڕینی شەریعەت و سیاسەت لەلایەن عەلمانیەکانی نێو جیهانی ئیسلامییەوە بریتیە لە: قیاس کردنی ئیسلام لەسەر نەصرانییەت.

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ:

باشە مادام دەقەکانی قورئان و سوننەت و سرو شتی ئیسلام و ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ مێژووی سێزدە سەدەیی دەوڵەتی ئیسلامیی زۆر بەڕوون و ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن کە شەریعەت و سیاسەت دوو شتی پێکەوە پەیوەست و تێکهەڵکێشن و ناگونجێ لە یەك دابڕێن! ئەدی ئەو بیرۆکەیەی لەیەك جیایی دین و ژین یان شەریعەت و حکومەت چۆن و لە چیەوە سەرچاوەی هەڵداوەو پەیدابووە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین:

لە ڕاستیدا ئەو بیرۆکەیە مەگەر چۆن ئەگەرنا تەنیا لەلایەن خەڵکی عەلمانی دژ بە ئیسلام یان نەشارەزا بە ئیسلامەوە خراوەتە ڕوو، ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکەشەوە تاکە بنەمای فیکریی ئەو بیرۆکەیە بریتیە لە قیاسکردنی ئیسلام لەسەر نەصرانییەت، کە بێگومان ئەوەش شتێکی هەڵەیەو بە زاراوی زانایان (قیاس مع الفارق)ە، چونکە ئیسلام و نەصرانییەت لە زۆر رووەوە لەیەك جیان، بۆ نموونە:

1) ئیسلام خاوەنی (قورئان)ە کە دوایین کتێبی خوایە بۆ مرۆڤایەتی و تاکە کتێبێکی خواشە کە بە ساغ و سەلامەتی و دەستکاری نەکراویی

ماوەتەوە، بەڵام نەصرانییەت خاوەنی چوار ئینجیلەکانی: (متتا، مەرقیس، لۆقا، یوحەننا)و چەند نامەیەکی (بۆڵس)و کەسانی دیکەیە کە قسەی چەند کەسێکن و لە شێوەی بەسەرهات و ژیاننامەو شتی ئاوادان و هیچ پەیوەندییان بە وەحی خواوە نیە!

2) ئیسلام بەرنامە (شریعة)یەکی هەیە کە پڕە لە یاساو ڕێسای جۆراو جۆری سیاسی وئابووری وکۆمەڵایەتی و جەنگ وئاشتی و ... هتد، بۆ ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی تاك و خێزان و کۆمەڵگاو دەوڵەت، بەڵام چوار[2] بەناو ئینجیلەکانی نەصرانییەت بێجگە لە هەندێك بابەت مەسەلەی رووحی وئەخلاقی چی دیکەیان تێدانیە، وەك شەریعەت و بەرنامەی ژیان.

3) لە ئیسلامدا مسوڵمانان هەموویان وەك یەك و یەکسانن لە بەرامبەر بەڕێوەبردنی شەریعەتداو هەرچەندە ڕێزی تایبەتی لە زاناو پسپۆرانی شەریعەت گیراوە، بەڵام نەکراون بە چین و دەزگا(طبقة و مؤسسة)یەکی تایبەت کە خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندی و ئیمتیاز بێ، بەڵام لە نەصرانییەتدا چینی پیاوانی ئایین (طبقة رجال الدين) هەیە کە پێی دەگوترێ (ئەکلیرۆس)و کۆمەڵێك ئیمتیازی جۆراو جۆری هەن و خۆیان بە نوێنەری خوا دادەنێن و بەناوی خواوە پسوولەی لێخۆشبوون(صك الغفران)دەدەن بە گوناهکاران و ... هتد!!

(2) چونکە خوا فەرمووبەتی (ئینجیل)ێکم بۆ عیسا (علیه السلام) ناردوە نەك چوار و زیاتریش!!

4) ئیسلام هیچ شتێكی تێدانیه نه له عەقیدەو نه له شەریعەتدا كه لەگەڵ عەقڵ و زانیاری و واقیعدا ناكۆك و نەگونجاو بێت، بەڵام نەصرانییەت كۆمەڵێكی زۆر شتی پووچ و ئەفسانەیی و لەگەڵ عەقڵ و واقیع و زانیاریدا دژو ناكۆكی تێدایه بۆ نموونه:

أ- خوا (سبحانەو تعالی) به سێ زانین كە: ( خوا، كوڕ، گیانی پیرۆزن)ن! وەك خوا فەرمویەتی:

﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ ..﴾ (المائدة-73)

ب- عیسا (علیه السلام) به كوڕی خوا زانین، وەك خوا (عزّوجل) له بەرپەرچدانەوەیان دا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَلاَ تَقُولُواْ ثَلاَثَةٌ انتَهُواْ خَيْرًا لَّكُمْ إِنَّمَا اللّهُ إِلَـهٌ وَاحِدٌ سُبْحَانَهُ أَن يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ لَّهُ ...﴾ (المائدة-171)

ج- بڕوا بوون بەوەی كه عیسا (علیه السلام) بۆیه له سێداره (خاچ) دراوه تاكو ببێته مایەی سڕینەوەی گوناهی گوناهباران و بۆته بەلاگێڕەوەو قۆچی قوربانی بۆیان!

د- بڕوابوون بەوەی كه ئەو نان (خبز)ەی له جەژنی فەصح (عید الفصح)دا دەخورێ و ئەو شەڕاب (خمر)ی دەخورێتەوه ئەوه گۆشتی جەستەی عیساو خوێنەكەیەتی !!

5) سیستەمی تیۆكراسی (الثیوقراسیة) كه به حوكمی دینی ناسراوه، لەژێر سایەی شوومی دینی شێوێنراوی عیسا (نەصرانیەت)دا له

ئەورووپا سەری هەڵداو هیچ پەیوەندییەکی بە جیهانی ئیسلامییەوە نیە، چونکە لە کۆمەڵگایەکدا کە دینەکەیان پاپاو قەشەو حوکمڕانەکان بە سێبەری خواو وەکیلی خوا دەزانن، زەمینەی سەرهەڵدانی ئەو جۆرە سیستمە ڕەخساوە، بەڵام لە کۆمەڵگایەکی ئیسلامییدا کە حوکمڕان لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێرێ [3] و بەیعەتی پێ دەدرێ[4] و پاشان لەسەری پێویست دەکرێ کە بە شەریعەتەوە پابەند بێت[5] وە بابای حوکمڕان خۆی بە وەکیل و جێگری خەڵك و کۆمەڵگا دەزانێ و، دەزانێ کە شەرعییەت پێدرانی و شەرعییەت لێ ستێنرانەوەی بەدەست خەڵکە، وەك خەلیفەی یەکەم (ابوبکر الصدیق) -خوا لێی رازی بێ- لە یەکەمین وتاری دوای هەڵبژێرران و بەیعەت پێکرانیدا گوتوویەتی: (قد ولیت علیکم ولست بخیرکم فان احسنت فأعینوني وانْ أساتُ فقوِّموني اطیعوني ما اطعت الله و رسوله فیکم فان عصیت الله ورسوله فلا طاعة لي علیکم ..)[6]

واتە: (بەسەرتانەوە کراومە سەرپەرشتیارو بەرپرس بەڵام چاکترینتان نیم، هەرکات چاکم کرد یارمەتیم بدەن وە ئەگەر خراپم کرد راستم بکەنەوە، و فەرمانبەرییم بکەن تاکو من فەرمانبەریی خواو

(3) ﴿وامرهم شورى بينهم﴾ الشورى-38-

(4) ﴿ان الذين يبايعونك انما يبايعون الله...﴾ الفتح-10-

(5) ﴿ثم جعلناك على شريعة من الامر فاتبعها..﴾ الجاثية-18-

(6) بروانە: (تاريخ الخلفاء) للسيوطي، صحيفه -69- وە(الأمامة والسياسة)لا بن قتية ج1 صحيفة-28-

پێغەمبەرەکەی بکەم، بەلاّم کە سەرپێچیم لێیان کرد گوێ ڕا یەڵی بۆکرانم لەسەرتان پێویست نیە..)
بەڵـێ: لە کۆمەڵگەیەکی ئاوادا مادام بە شەریعەتەوە پابەندبن زەمینەی سەرهەڵدانی ئەو جۆرە سیستەمە رەخ ساو نیە، چونکە شەریعەت سایەو سەروەری هەموو لایەکەو کۆ مەڵگاش هەمووی لە بەرانبەر شەریعەت و یاساکانیدا یەکسانن بەگەورەو بچووك و درشت و وردەوە.
وە لە درێژەی تەمەنی دەوڵەتی ئیسلامییدا هەر چەندە کەموکوڕی زۆری تێدا پەیدابوونە بەلاّم:
دەسەلاّتی جێبەجێکردن (السلطة التنفيذية) هیچ کاتێك نەیتوانیوە- مەگەر بە دەگمەن- کە دەست وەربداتە کارو باری هەردووك دە سەلاّتی یاسادانان و دادوەریی (السلطة التشريعية والسلطة القضائية) بەڵکو تا رادەیەکی زۆر ئەو دوو دە سەلاّتە بە سەربەخۆیی بەدە ست زانایا نەوە ماونەتەوە، لە حالێکدا کە لە دەوڵەتانی رۆژئاوای نەصرانییدا هەرکام لە سێکوچکەی شوومی (پاپا، پاد شا، دەرە بەگ) هەر سێك دە سەلاّتی: جێبەجێکردن و یاسادانان و دادوەریی یان لەدە ستی خۆیا ندا کورت هەڵێنابوو!

## (3) دیاری نەکرانی میکانیـزمی وردی دەوڵـەتداریی و حوکمڕانیی لە ئیسـلامدا حیکمـەتی گەورەی تێدایـە :

گەلێك جاران نەیارانی ئیسلام و تەوژمی ئیسلامی مەسەلەی دیاری نەکرانی چۆنیەتی پێکهێنانی کیان و قەوارەی سیاسی و میکانزمە تەفصیلییەکانی دەکەنە بەڵگەی نەداریی ئیسلام لە رووی سیاسیەوە! بەڵام لە راستیدا نەك هەر وانیە بگرە بە پێچەوانەشەوەیە، بابزانین چۆن؟!

لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوای کاربەجێ و پەنهانبین کۆتا بەرنامەی بێهەڵەو پەڵەی خۆی بە پێغەمبەری کۆتایی (محمد)دا ﷺ بۆ تێکڕای بەشەر ناردوە هەتا ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی کۆتایی پێ دێ، بۆیە خوای بەبەزەیی (سبحانەو تعالی) هەموو ئەو لایەن و بوارانەی ژیانی ئینسان کە زیاتر بە رووح و ماهیەتییەو پەیوەستن و ناگۆڕێن یان کەمتر وایە گۆڕانیان بەسەردابێت وەك: ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و ئەخلاق و ئاکارو بنیاتنانی خێزان، کۆمەڵێك یاسای وردو تەفصیلی بۆ داناون و نوختەیان تێدا خراونە سەر پیت. بەڵام ئەو لایەن بوارانەی دیکەی ژیان و گوزەران کە گۆڕانیان بەسەر دادێ و زیاتر پەیوەستن بە جەستەو رواڵەت و دیوی ماددی ژیانەوە وەك: سیاسەت و ئابووری و جەنگ و ئاشتی، خوای زاناو شارەزا بەوەندە وازی هێناوە کە کۆمەڵێك بنەماو هێڵی گشتییان بۆ دابنێ کە چوارچێوەو بازنەیەکی فراوانیان بۆ دیاری بکات و چەندان ناوچەی بۆشایی (مناطق الفراغ)یش بهێڵێتەوە!

دیارە حیکمەت و نهێنی ئەو مەسەلەیەش زۆر ڕوونە ئەویش ئەوەیە کە

خوای کاربەجێ نەیویستوە بۆ ئەو لایەن و بوارانەی ژیان و گوزەران کە گۆڕان و پەرەستاندن (تغیّرو تطور) زۆر ڕوو یان تێدەکات کۆمەڵە یاسایەك دیاری بکات کە دوایی ببنە قاڵب و چوار چێوەیەکی تەنگ و نەگونجاو لەگەڵ قۆناغەکانی ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگادا.

چونکە ئەگەر هاتباو شەریعەت لەو لایەن و بوارانەشدا وەك لایەن و بوارەکانی عەقیدەو عیبادەت و ئەخلاق و خێزان نوختەی خستبایە سەر پیت و وردەکارییەکانی باسکردبایە، یان دەبوو بەگوێرەی ئاستی ئەوسای کۆمەڵگاکان دیاری کردبایە کە بێگومان لەبەر سادەیی و ساکاریی لەگەڵ قۆناغەکانی دیکەی ژیانی بەشەردا نەدەگونجا! یان دەبوو بە پێی دواقۆناغی گەشەسەندووی ژیانی بەشەر بووایە کە دیارە ئەوکاتەش بۆ قۆناغەکانی پێشتر نەدەگونجاو نەدەبوو، واتە: ئەگەر بەگوێرەی قۆناغ و هەلومەرجی دابەزینی قورئان بووایە، دوایی بۆ قۆناغەکانی دیکەی داهاتوو تەنگ (ضیّق) دەردە چوو، وە ئەگەر بەگوێرەی دواقۆناغی گەشەکردنی ژیان و گوزەرانی بەشەر بووایە بۆ قۆناغەکانی پێش خۆی فشوفۆڵ (فضفاض) دەبوو!

بەڵام لێرەدا نابێ هیچ کەس وابزانێ کە ئیسلام وەك چۆن وردەکارییەکان (تفاصیل)ی چۆنیەتی پێکهێنانی دەوڵەت و حکومەتی باس نەکردوە، ئەو بنەماو پایە بنەڕەتییانەشی باس نەکردوون کە هێڵەگشتییەکان و چوارچێوەی دەوڵەت و حکومەت پێك دەهێنن، بەڵکو لەو ڕووەوە کۆمەڵێك شتی باس کردوە کە بە بناغەی سیاسەت و حوکمی ئیسلامی دادەنرێن و لە داهاتوودا ئاماژەیان پێ دەکەین.

## (4) پابەندبوونی حکوومەت بە شەریعەتەوە سەرناکێشێ بۆ وشکی (جمود)، چونکە ئەسڵ لە مامەڵەکان (المعاملات)دا ڕەوایی و دەستکراوەییە:

کەسانێکی لە ئیسلام نەشارەزا یان خۆگێلکەر لە نەیارانی ئیسلام و تەوژمی ئیسلامی، هەرکات گوێبیستی وشەی: شەریعەت و حکوومەتی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامیی، بوون، یەکسەر تۆمەتی دۆگما بوون و وەستان و (جمود) دەکەنە بیانووی ڕەفزکردنی پابەندیی کۆمەڵگاو حکومەت بە شەریعەتەوە! بۆیە بۆ ڕەواندنەوەی تەمی ئەو گومان و تۆمەتە دەڵێم:

یاساکانی ئیسلام بە گشتی بەسەر سێ تەوەرەدا دابەش دەبن:

أ- جیهانبینی و ئیمان وعەقیدە.

ب- عیبادەت و ئەخلاق .

ج- هەڵسوکەوتەکان (المعاملات) .

جا هەرچی تەوەرەی یەکەم و دووەمن وەك پێشتریش باسمان کرد ئەوە ئیسلام نوختەی تێیاندا خستۆتە سەر پیت و وردو درشتیانی خستۆتەڕوو، بەڵام تەوەرەی سێیەم (هەڵسوکەوتەکان) کە دیارە حوکم و سیاسەتیش جۆرێکە لە جۆرەکانی بەڵکو گرنگترین جۆریەتی، ئەوە ئیسلام تەنیا بنەما سەرەکییەکان و هێڵە گشتییەکانی خستوونەڕوو بەڵام وردەکارییەکان (تفاصیل)ی بە بۆشاییی بەجێ هێشتوە بۆ گۆڕان و پەرەستاندنەکانی ژیان و گوزەران تاکو خەڵکی بەگوێرەی

پێداویستییەکانیان کۆشش (اجتهاد)یان بۆ بکەن.

کەواتە:

لە کاتێکدا کە شەریعەت لە بواری جیهانبینی و ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و ئەخلاق و خێزاندا کارێکی کردوە کە مرۆڤ ئەرکی کۆشش کردن و خۆماندووکردنی لە کۆڵ بکەوێ، لە بواری هەڵسو کەوتەکاندا بە پێچەوانەوە کارێکی کردوە کە بە جیددی خەمخۆرانە کۆشش بکات تاکو وردەکاریەکانی ئەو بوارە لە چوارچێوەی فراوانی شەریعەت و بنەما سەرەکیەکانیدا دیاری بکات.

هەربۆیەش زانایانی ئیسلام لەو بوارەدا بنچینەیەکی شەرعییان داناوە کە دەڵێ: (الأصل في العبادات الحظر والأصل في المعاملات الإباحة) واتە: (لە بواری خواپەرستییەکاندا بناغە ڕێ لێگیرانەو لە بواری هەڵسوکەوتەکانیشدا بناغە ڕێ پێدرانە).

بە کورتی:

ئیسلام لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا  کە بابەتی دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی گرنگترین بەشیەتی- ڕێی لەبەردەم ئینساندا ئاوەڵاکردوەو بە تەواوی دەستی کردۆتەوە کە چۆن داد گەریی دەچەسپێ و، بەرژەوەندی دابین دەبێ ئاوابکات، وەك دوایی زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتە.

بۆیە پابەندیی حکومەت بەشەریعەتەوە تەنها ئەوەیە کە ڕووح و هەناوی بۆ پەیدادەکات و لە لادان و خلیسکان دەیپارێزێ، ئەگەرنا ڕێی هیچ شتێکی چاك و سودبەخشی بۆ خەڵك و کۆمەڵگا لێناگرێ، وەك مێژووی (1300) ساڵەی دەوڵەتی ئیسلامی سەلماندوویەتی!

## (5) دەستوور و یاسای دەوڵەتێکی مسوڵمان پێویستە تا کە سەرچاوەکەی شەریعەت بێ:

بێگومان هەبوونی دەستوور یان یاسای بنەڕەتیی (القانون الأساسي) وەك لە هەندێك شوێنان وای ناو دەبەن، شتێکی پێویستە بۆ هەر دەوڵەت و قەوارەیەکی سیاسی، چونکە دەستوور هێڵە گشتی و بنەما سەرەکییەکانی بەڕێوەچوونی دەوڵەتی تێدا دیاری دەکرێن و چۆنیەتی پەیوەندی و هاوکاری نێوان هەرکە سێك دەسەڵاتی: یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی(التشریع والتنفیذ والقضاء)و سنووری هەرکامیانی تێدا دیاری دەکرێ و... هتد.

شایانی باسیشە یەکەمین دەستووری نووسراوە لە مێژووی بەشەردا بە دانپێداهێنانی مێژووزانان ئەو دەستوورەیە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەتی ئیسلامیی مەدینە داینا، کە بە (الصحیفة) یان (الوثیقة) ناسراوەو لە چل و شەش ماددە پێکهاتوە، ئنجا دیارە کە حاڵەتی ئاسایی و شەرعیی خەڵکێکی مسوڵمانی وەك عیراق یان کوردستان، ئەوەیە کە هەم دەستوورو یاسای بنەڕەتیی (القانون الأساسي) کیان و قەوارە سیاسییەکەی و هەم یاساکانی، هەڵقوڵاوی یەك تا کە چاوگ بن، کە شەریعەتی بێخەوشی خوای دادگەرو کاربەجێیە، چونکە:

مسـولمانبوونی تاك و کۆمەڵ بەبێ پابەندی بە ئیسلامەوە هیچ واتاو

نێوەڕۆكێكی نابێ! ئاخر مسوڵمان (مسلم) كەسێكە بۆ خوا (تبارك و تعالى) ملكەچ بێت و ملكەچییش بۆ خوا بە پابەندی بە ئیسلامەوە دەبێ ئەو ئیسلامەی كە خوا بە بەرنامەی ژین بۆی پەسندكردووین ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا ...﴾ (المائدة-3) وە هەواڵی پێداوین كە جگە لەوی شوێنكەوتنی هیچ بەرنامەو ئایینێكی دیكەمان لێ قبوڵ ناكات:

﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (ال عمران-85)، دیارە بەدیلی پابەندییش بە شەریعەتی خواوە كە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە- شوێنكەوتنی هەواو ئارەزووی نەزانانەو جێگرەوەی حوكم و بەرنامەی خواش تەنیا حوكمی نەفامانە، وەك خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاء الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾(الجاثية-18) ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ!﴾ (المائدة-50)

كەواتە:

دروست نیە دەستوورو یا سای دەوڵەتێكی مسوڵمان بێجگە لە شەریعەتی ئیسلام لە هیچ سەرچاوەیەكی دیكەوە هەڵبقوڵێ، هەربۆیەش ئەوەی كە لە دەستووری ئێستای عیراقدا هاتوە كە دەڵێ[7]: (شەریعەتی ئیسلامی سەرچاوەیەكی سەرەكی یاسادانانە ..)

---

(7) دەقی ئەو قسەیە كە لە ماددەی (2) برگەی یەكەمدا هاتوە ئاوایە (ئیسلام ئایینی فەرمی دەوڵەتە و سەرچاوەیەكی بنەرەتییە بۆ یاسادانان) بڕوانە: ڕەشنووسی دەستووری عیراق، بەشی یەكەم، سەرەتا بنچینەییەكان، لاپەڕە-6-

مەگەر بە تەئویل کردنەوە ئەگەرنا هەڵە ـیەو ڕا ست ن ـیە، چونکە پێویستە شەریعەت تاکە چاوگی دەستوورو تەنیا سەر چاوەی یا سادانان (تشریع)یش بێت، ئەوجار ئیسلام کردنە ئاییـن و بەرنامەی ژین و شوێن شەریعەت کەوتن، دێتە دی!

مەبەستیش لەو تەئویل کردنە ئەوەیە کە بگوترێ:

مەبەست لە ڕِ ستەی: (ئیـ سلام ... سەر چاوەیەکی بنەڕەتیـ یە ـبۆ یاسادانان) ئەوەیە کە وەك ئە سلّ و بنا غە ئیـ سلام و شەریعەتەکەی بنەڕەتی یاسا دانانەو وەك شتی لاوەکی و (فرعي)یش سوود ـلە شتی دیکەش وەردەگیرێ، دیارە هیچ کاتێکیش دروست نیە لق (فرع) لە ـگەڵ بنەڕەت (اصل)دا تێکبگیرێن!

ئنجا بۆیەش دروست و ڕەوانیە کە هیچ سەچاوەیەکی دیـ کە بکرێ ـتە هاوبەشی ئیسلام و شەریعەت، لە بواری یاساداناندا، چونکە تەنها خوا بە پەروەردگارو پەرستراو و یاسادانەر (ا ـلرّب و الأ ـلە وا لحاکم) زا ـنین، بناغەی مسوڵمانەتییەو ئەو راستییە مەزنە چەندان ئایەتی ـبە پـ ـیێزی کتێبی خوا (سبحانە وتعالی) زۆر بەڕوونی و ڕاشکاویی خستوویانەتەڕوو، بۆ نموونە:

یەك- ﴿ قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ..؟!!﴾ (الأنعام –164)

واتە: ﴿ئایا جگە لە خوا پەروەردگارێکی دیکە بخوازم لە حاڵێکدا کە ئەو پەروەردگار خاوەن و مشورخۆرو سەروەر- ی هەمووشتێکە؟!﴾.

دوو- ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ...﴾ (محمد-19)

واتە: ﴿دەجا بزانە کەوا جگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکە نین﴾ واتە: بێجگە لە خوا هیچ کەس و هیچ شتێك شایستەی پەرستران نییە، پەرسترانیش هەرکام لە- خۆشـویستن و بە گەورەگرتن و فەرمانبەریی بۆ کردن و شەرم لێکردن و لێتـرسان- دەگرێتە خۆی.

سێ-﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾(یوسف-40)

واتە: ﴿حوکم تەنیا هی خوایە، فەرمانی کردوە کە جگە لەو نەپەرستن، ئائەوەیە ئایینی ڕاست...﴾ جا دیارە کە تەنیا کاتێك بەس خوا بە پەروەردگارو خاوەن و سەروەر دەگیرێ، کە ئایین و شەریعەتی خوا لە هەموو ڕوویەکەوە پەیڕەویی لێ بکرێ و بکرێتە بەرنامەی ڕێکخەری ژیان و گوزەران بە هەموو بوارەکانییەوە. هەروەها بەس کاتێك خوا بەتەنها دەپەرسترێ کە تاك و کۆمەڵ وەك چۆن نیشانەو دروشمەکانی خواپەرستی (شعائر العبادة)[8] تەنیا پێشکەشی خوا دەکات و بەشی کەسی دیکەیان تێ ناخات، بەرنامەکانی زیندەگی (شرائع الحیاة)یش تەنها لە خواو شەریعەتەکەیەوە وەردەگرێ و ژیانی تاکیی و خێزانیی وکۆمەڵیی لە هەموو بوارەکانی: سیاسەت و ئابووری وکۆمەڵایەتی وجەنگ وئاشتی و ئەخلاقیی و .. هتددا بە پێی یاساکانی شەریعەت ڕێك دەخات.

(8) وەك : نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، زیکر، دووعـا، نەزر، سەربڕین،....هتد.

دیسان تەنها کاتێك بەس خوا بە یاسادانەر (حاکم، مشَرِّع) دادەنرێ، کە بۆ رێکخستنی سەرجەم لایەنەکانی ژیان و گوزەران پرس بە شەریعەتی خوا بکرێ و پابەندیی بە یاسا و بڕیارەکانییەوە بکرێ و گوێی بۆ بگیرێ و فەرمانبەریی بۆ بکرێ.

ئەگەرنا پێم نالێی کەسێك: کە لە بەڕێوەبردن و رێکخستنی ژیان و گوزەرانـــــی تاکی و خێزانیی و کۆمەڵییدا یان بە یەکجاریی ئایین و شەریعەتی بێ هەڵەوپەڵەی خوا پشت گوێ دەخات، یان حیسابێکی لام سەللاییی بۆ دەکات و رێچکەو بیردۆزەکانی لەگەڵ تێکەڵ دەکات و دەیهێنێتە ریزی بەرنامەو بیـــردۆزە هەڵقولاوەکانی بیـــرو زەینی مرۆڤ و بۆ ئیدارەکردنی خەڵك و ولات پشك و بەشێکی گچکە یان گەورەی پێ دەدات! چۆن دەتوانێ خۆی بە خوا بەیەکگر (مُوَحِّد) دابنێ و وا خەیاڵ بکات کە مسوڵمانەو تەنها خوا بە پەروەردگار و پەرستراو و یاسادانەر دەزانێ؟!!

ئنجا ئەوە هەمووی بەنسبەت دەستووری عیــراقەوە کە تا رادەیەك کاری تەواوبووە، بەڵام بۆ پرۆژەی دەستووری کوردستان و پێگەی ئیسلام و شەریعەتەکەی لە نێویدا ئەوە بێگومان قسەوباسی زۆرو زەوەند هەڵدەگرێ و هەڵەوپەڵەو ناتەواویی زۆری تێدایە کە من هەوڵ دەدەم بە خێرایی و لە چەند خاڵێکی کورتدا ئاماژەیان پێ بکەم:

1- جارێ بەرلەهەمووشتێك لەو پرۆژەیەدا باسی (ئایینی فەرمی)

نەكراوە كە دەبێ ئیسلام بێ،لە حاڵێكدا كە لە دەستووری عیراق و لە سەرەتای برگەی یەكەمی ماددەی دووەمدا گوتراوە: (ئیسلام ئایینی فەرمی دەوڵەتە...)!

ئنجا ئەوە لە كاتێكیش دایە كە زۆرینەی (أغلبیە) ی موسوڵمانان لەسەر ئاستی كوردستان زیاترە لە زۆرینەیان لەسەر ئاستی عیراق!

ئنجا ئەگەر ئەوەش بكرێتە بیانوو كە: مادام كوردستان هەرێمێكی فیدراڵە لە كیان و دەوڵەتی عیراق، كەواتە دەستووری عیراق كوردستانیش دەگرێتەوەو ئایینە فەرمییەكەی كە ئیسلامە هی هەموو خەڵكی عیراقە! دەڵێین ئەوە بیانوو و پاساوێكی بێ جێ یە، چونكە ئەو حاڵەتە سەرجەم ماددەو برگەكانی دیكەی دەستووریش دەگرێتەوە، ئەدی بۆچی بۆ ئەو ماددەو برگانەی دیكەش هەمان رێچە رەچاو نەكراوەو بەوەندە واز نەهێنراوە كە لە دەستووری عیراقدا هاتوون، بەڵكو هەموویان و بگرە هەندێكیان روونترو چاكتریش لە پرۆژە دەستوورەكەی هەرێم دا تۆماركراون؟!!

ئایا هەر بەقسەو بانگەشە خۆ لە خەڵكی بە موسوڵمانترو دیندار زانین، دادمان دەدات چ بۆ دنیاو چ بۆ دوارۆژیش؟! ئەدی نابێ موسوڵمانتربوونەكەمان لە دەستوورەكەماندا رەنگبداتەوە؟!! كە بەداخەوە ئێستا بە پێچەوانەوەیەو ئەوەی پرۆژەكە كەمتر موسوڵمانەتی گەلەكەمان پیشان دەدات! ئاشكراشە كە لە مەیدانی قسەو باساندا

قسەی بێ بەڵگەو دەلیل هیچکەس فل سێکی پێ نادات، خواش (عزّوجل) فەرموویەتی:

﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَـانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ (النمل-64)

واتە: ﴿بڵێ"ئەگەر راست دەکەن بەڵگەکەتان بێنن!"﴾ .

2- لە حاڵێکدا لە دەستووری عێراقدا لە ماددەی (2)دا باسی ئیسلام و رۆڵی شەریعەت کراوە، لە پرۆژەی دەستووری هەرێم دا ئەو مەسەلەیە خراوە تە ماددەی (7)ەوەو بیگو مان ریزبە ندیی (ترت یب)ی ماددەکانیش لە گرنگترەوە بۆ گرنگ چوونیان ت یدا رە چاو کراوە، کەواتە هەر لەرێوە دیارە کە بایەخ پێدانی پرۆژە دە ستوورەکەی بە ئیسلام هەرێم زۆر کەمترە لەهی دە ستووری ع یراق، هەر چەندە خۆشمان بە مسوڵمانتر دەزانین!

3- ئێستاش با سەرنجی ماددەی (7) بدەین کە تەرخان کراوە بۆ د یاری کردنی پێگەی ئیسلام و شەریعەتەکەی لەو پرۆژەیەدا کە دەوی سترێ بکرێتە دەستووری هەرێمی کوردستان:

(ئەم دەستوورە جەخت لەسەر ناسنامەی مسوڵمانێتی زۆرینەی گەلی کوردستان دە کات و ب نەماکانی شەریعەتی ئی سلام یەکێکن لە سەرچاوەکانی یاسادانان، هەروەها تەواوی مافە ئایینیەکانی مەسیحی و ئێزیدی و هی دیکە لە ئازادیی باوەڕو پ یادەکردنی ئایین دە ستەبەر دەکات)[9].

---

(9) پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان عیراق ، لاپەڕە- 9 -

ئەم رەخنەو تێبینی یانەش لەسەر ئەم ماددەی حەوتە دەخەینەڕوو:

أ/ گوتراوە: (ئەم دەستووره جەخت لە سەر نا سنامەی مە سولّمانێتی زۆرینەی گەلی كوردستان دەكات). بەلاّم لە دە ستووری عێرا قدا گوتراوە: (ئەم دەستووره پارێزگاری لیكردنی ناسنامەی مسولّمانێتی بۆ زۆرینەی خەلّكی عیراق مسۆگەر دەكات  یضمن هذا الد ستور الحفاظ على الهوية الاسلامية لغالبية الشعب العراقي).

ئاشكراشە كە وشەی (جەختی لەسەر دەكات -یؤكد) ماناكەی بێ هێزترە لە وشەی (مسۆگەر دەكات -یضمن)!!

چونكە جەخت كردنەوە تەنها پەیوەندی بە ئێ ستاوە هە یە وەك واقیعێك، بەلاّم مسۆگەركردن ئێستاو داهاتووش دەگرێتەوەو روو حی بەرپرسیارێتیشی لە بەرانبەر ئیسلام و مسولّمانەتیدا زیاتر تێدایە!

ب/ گوتراوە: (بنەماكانی شەریعەتی ئیـ سلام یەكێكن لەسەر چاوە سەرەكیەكانی یاسادانان).

جا ئێمە پێشتر باسی ئەو مە سەلەیەمان كردو لـ ێرە دوو بارەی ناكەینەوە، بەلاّم ئەوەندە دە لّێن: كە ئا یا سەر چاوەكانی دیـ كەی یاسادانان جگە لە شەریعەتی ئیسلامیی چین و چەندن؟! ئایا دەكرێ تۆ لە دەستوورەكەتدا تەنها یەكێك لە سەرچاوەكانی یاســـــادانان بە خەلّك بلّێی و نەزانن سەرچاوەكانی دیكەت چین؟!

پاشان دەلّێــین:

ئەگەر بەراوردێك لە نێوان دستووری عیراق و پرۆژە کەی دەستووری هەرێمدا بکەین زۆر بەڕوونی دەردەکەوێ کە بە پێی ئەو پرۆژەیە- جارێکی دیکەش لە مسوڵمانیێتیدا دەکەوینە دوای خەڵکی دیکەوە نەك وەك ئیددیعا دەکەین پێشیان بکەوین! چونکە دەستووری عیـراق لە برگەی یەکەمی ماددەی(2)دا دەڵێ:

(ئیسلام ئایینی فەرمی دەوڵەتەو سەر چاوەیەکی سەرەکی یاسادانانە الأسلام دین الدولة الرسمي وهو مصدر أساسٌ للتشريع).

بەڵام لە پرۆژەکەی هەرێمدا لە جیاتی ئیسلام، باسی (بنەماکانی شەریعەت)کراوە، دیارە سەرچاوەبوونی ئیسلامیش زۆر جیاوازە لە سەرچاوەبوونی (بنەماکانی شەریعەت) چونکە ئیسلام لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە بەڵام بنەماکان دەگونجێ مشتومڕیان لە سەر بکرێ کە چەندن و چۆنن، بە پێچەوانەی دەقەکانی شەریعەتەوە بەتایبەت ئایەتەکانی قورئان کە مسوڵمانان لەسەر پیتێکی کێشەیان نیە!!

ج/ لە پرۆژە دەستووری هەرێمدا باسی ئەوە نەکراوە کە نابێ هیچ یاسایەك دەربچێ لە گەڵ یاسا (حکم)ە نەگۆڕو چە سپاوەکانی ئیسلامدا دژ بوەستێ، بەڵام لە دەستووری عیراقدا ئەوەش بەڕاشکاویی هاتوە: (نابێ یاسایەك دەربچێ کە لە گەڵ حوکمە نەگۆڕەکانی ئیسلام ناکۆك بێت لايجوز سن قانون يتعارض مع ثوابت احكام الأسلام). کە دیارە ئەمەش هەنگاوێکی دیکەی بەرەودواو بەجێمانە لە خەڵکی دیکە لە بواری مسوڵمانەتیدا!

دیارە ئەوە پرۆژە دەستوورەی هەرێم کەلێن وکونی دیکەشی زۆرن[10] و لێرەدا دەرفەتی خستنەڕووی هەموویانمان نییەو خەڵکێکیش قسەو باسیان لە بارەوە کردوون و دەکەن.

(10) بۆ نموونە: لە بڕگەی (شەشەم)ی ماددەی (67)دا هاتوە:

(ڕێگە بەپارت و رێکخراو و کۆمەڵە و تاکەکەسیش نادرێت لە پێناو بەدیهێنانی دەسکەوتی پارتایەتی یان هەڵبژاردن یان شتی دیکە، ئایین یان بەشێك لە دێوەڕۆکی کتێبە پیرۆزەکانی، یان ریوڕەسمێکی ئایینی وەك شێوازێك بۆ کەمکردنەوە لە پێگەی سیاسی یان کۆمەڵایەتی کەسانی دی بەکاربهێنێ) لاپەڕە-28-

ئا شکرایە هەرکەسێك ئەم دەقە بخوێنێتەوە یەکسەر دەزانێ کە مەبەست پێی ڕێگاگرتنە لە لایەنە ئیسلامییەکان و تەوژمی ئیسلامیی! جا من دەڵێم:

یەکەم: ئەوە پێچەوانەی ئازادیی بیروڕا دەربڕینەو نابێ ڕێ لە هیچ کەس بگیرێ قسەی خۆی بکات با زیانی خەڵکی دیکەی نەیاریشی تێدابێت مادام قسەکردنەکە بەشێکە لە عەقیدەو بۆچوونی فکریی و سیاسی خۆی!

دووەم: ئا یا بابا یەکی ئیسلامی کە بەرنامەکەی ئیسلامە ئەگەر ئایەت و فەرمووودە بۆ خەڵکی نەخوێنێتەوە چۆن چۆنی لە بەرنامەو ڕێبازەکەی خۆی کە ئیسلامە حاڵییان بکات، مەگەر بەبێ ئایەت و فەرموودە باسی دین و ئیسلام دەکرێ، وە ئا یا ئیسلام جگە لە قورئان و سوننەت چییە؟!!

سێیەم: مادام خەڵکەکەمان موسوڵمانەو دەکەوێتە ژێر کاریگەریی (دەقەپیرۆزەکان) با خەڵکی دیکەش (واتە غەیری ئیسلامییەکان) بگەڕێتەوە بۆ دەقەپیرۆزەکان و چی دی ڕەخنەیان لێنەگرێ و دژایەتییان نەکات، نەك ڕێ لە ئیسلامییەکانیش بگیرێ بیان خوێنێتەوە!

چوارەم: لە کۆتاییشدا دەڵێم:

شتێکی ماقووڵ و مەنتیقییە ڕێ لە کەسانێك بگیرێ ئایەت و فەرموودە بخوێننەوە کە بڕوایان پێیان نییە و، پێیان وایە بەکەڵکی ئەمڕۆ نایەن، بۆ ئەوەی دوچاری نیفاق و دووڕوویی و دووانەتی (الازدواجية) نەبن! بەڵام یەکجار شتێکی سەیرو بێ جێیە ڕێ لە کەسانێك بگیرێ ئایەت و فەرموودە بخوێننەوە کە ئامانجیان ئەوەیە ئایەت و فەرموودەکان بکرێنە بەرنامەو پەیڕەوی ژیان و گوزەرانی تاك و خێزان و کۆمەڵگا!

بە کورتی: با هەرکەسە قەناعەتی بە چ دینێك و چ دەقێکی پیرۆز هەیە بیانخاتەڕوو، وە خەڵکیش سەرپشکە چی و کێ هەڵدەبژێرێ و گوێ بۆ کام دەقە ڕادەدێرێ!

ئنجا لێرەداو لە کۆتایی ئەم بابەتەدا[11] دەڵێیــن:

پێویستە راستییەك روون بکرێتەوە کە لــێ‌بێ ئا گابوونی ئی شکال و دردۆنگی زۆری بۆ کەسانێکی نەشارەزا لە ئیسلام و شەریعەتە بێ هەڵەو پەڵەکەی درووست کردوە ئەویش ئەوەیە کە:

مەبەست لە سیاسەت لە روانگەی ئیسلامەوە هەر کردەوەو رەفتارێکە کە لە بەرژەوەندی خەڵکی دابێ و خێرو قازانجیانی تێدابێ، ئیدی مەرج نیە کە حەتمەن دەقێکی قورئان و سوننەتی لەسەر بێ، بەڵکو هەرشتێك سەربکێشێ بۆ چەسپاندنی دادگەری و ببێتە مایەی لا چوونی ستەم و خراپەو زیان و، هێنانە دی خێرو چاکەو قازانج ئەوە بە شتێکی حەق و شەرعی دادەنرێ، بۆچی؟! چونکە خوای پەروەردگار و کار بەجێ لە چەندان ئایەتی بەپیێزی خۆیدا فەرمانی کردوە بە چەسپاندنی دادگەری و هێنانەدی خێرو چاکەو بەرژەوەندی و ریشەکێش کردنی ستەم و خرا پەو زیان، بۆ نموونە:

1- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقَيرًا فَاللّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ وَإِن تَلْوُواْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ (النساء-135)

(11) بابەتی (دەبێ دەستوور و یاسای دەوڵەتێکی مسوڵمان تاکە سەرچاوەکەی شەریعەت بێ).

2- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ (المائدة-8)

3- ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ (الحديد -25)

4- ﴿..وأفعلوا الخير لعلكم تفلحون﴾ (الحج -77)

5- ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً...﴾ (البقرة -83)

6- ﴿وأحسنوا إن الله يحب المحسنين﴾ (البقرة -195)

7- ﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (التوبة-71)

8- ﴿ ألا لعنة الله على الظالمين ﴾ (هود-18)

9- ﴿ وَالَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللّهِ مِن بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ اللّهُ بِهِ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ أُوْلَئِكَ لَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدار﴾ (الرعد -25)

10- ﴿ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ (شعراء-183)

کۆتایی ئەم باسەش بەچەند قسەیەکی نەستەقی (ابن القیم الجوزي) دێنین کە لەوبارەوە کردوونی، گوتوویەتی:

(فالسياسة ماكان من الافعال بحيث يكون الناس معه أقرب الى الصلاح وأبعد عن الفساد، وإن لم يُشرّعه الرسول ﷺ ولا نزل به وحى .. فهي لاتنحصر فيما نطق به الشرع، وانما تشمل مالم يخالف الشرع.. والسياسة العادلة غير مخالفةٍ للشريعة الكاملة بل هى جزءٌ من أجزائها و بابٌ من أبوابها وتسميتها (سياسة) أمرٌ أصطلاحى، والا فأذا كانت عدلاً فهى من الشرع... ومن له ذوقٌ في الشريعة، واطلاعٌ على كما لها وتضمنها لغاية مصالح العباد فى المعاش والمعاد ومجيئها بغاية العدل الذى يسع الخلائق وأنه لاعدل فوق عدلها ولا مصلحة فوق ما تضمنته من المصالح، تبيّن له ان السياسة العادلة جزءٌ من اجزائها و فرعٌ من فروعها...)[12]

واتە: (کەواتە سیاسەت سیاسەتی شەرعی- هەرکردەوەیە کە کە خەڵکی بەهۆیەوە لە چاکەو خێر نزیکتر و لە خراپەو زیان دوور تربن، هەرچەندە پێغەمبەریش ﷺ بڕیاری لەسەر نەدابێ و وەحیشی لە سەر نەهاتبێتە خوارێ... واتە سیاسەت تەنها لەوەدا کورت هەڵنەهاتوە کە شەرع فەرموویەتی، بەڵکو گرنگ ئەوەیە پێچەوانەی ئەوە نەبێ کە شەرع فەرموویەتی و لەگەڵی تێك نەگیرێ... وە سیاسەتی دادگەرانەش نەك هەر پێچەوانەی شەریعەتی تێرو تەواو نییە بگرە بەشێکە لە

(12) بڕوانە: (اعلام الموقعين عن رب العالمين) ج/4 ص/375،373،372 وە (الطرق الحكمية فى السياسة الشرعية) ص/17-19-ط:1977 وە بڕوانە : (الاسلام والسياسة) د.محمدعمارة، ص/15-16 الطبعة الاولى لسنة:2004-2005

بەشەکانی و یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی، وە ئەوە کە بەناوی سیاسەتەوە ناسراوە شتێکی زاراوەیی یە ئەگەرنا مادام دادگەریی بێت بەشێکە لە شەرع...

وە هەرکەسێکیش سەرەدەریی یەك لە شەریعەتدا بکات و شتێك بزانێ لە تێرو تەواوییەکەی و دەستەبەرکردنی بۆ ئەو پەڕی بەرژەوەندییەکانی خەڵك و هێنانی بۆ دادگەرییەك کە جێی هەموو درو ستکراوەکانی تێدادەبێتەوە، وە هەرکەسێك بزانێ کە هیچ دادگەرییەك لە سەرووی دادگەریی شەریعەتەوە نییەو هیچ بەرژەوەندییەك لە سەرووی ئەو بەرژەوەندییانەوە نیە کە گرتوونیە خۆی، ئەوە بۆی دەردەکەوێ و دڵنیا دەبێ کە سیاسەتی دادگەرانە بەشێکە لە بەشەکانی و لقێکە لە لقەکانی..).

ئنجا بۆ ئەوەی چەمك و واتای: (تەنها شەریعەت بەسەر چاوەی دەستوورو یاسا زانین) رۆشنتـر بێت دەڵێین:

بێگومان شەریعەت نەك هەر رێمان دەدات بەڵکو لەسەریشمان فەرز دەکات کە لە بواری هەڵسوکەوتەکان (المعاملات)دا- کە حوکم و سیاسەت بوارو بەشێکیەتی-، هەرکام لە: کۆڕای زاناو شارەزایان (اجماع العلماء والخبراء)و قیاس و عەقل و ئەزموونی خۆمان و خەڵکی و، عورف و باوی کومەڵگاو، شەرعی پێش خۆمان (شرع من قبلنا)و، بەرژەوەندییە رەهاکان (المصالح المرسلة)و ... هتد بکەینە مایەی بەهرە وەرگرتنمان

مادام لەگەڵ دەقێکی شەریعەتدا ناکۆکی و تێکگیرانیان نەبێ[13]- چا دیارە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نیە کە بە درێژی باسی هەرکام لەو شتانە بکەین کە زانایان بە سەرچاوەکانی یاسادانان (مصادر الت شریع) یان بەڵگەکانی یاسادانان (أدله التشریع) ناوزەدیان کردوون، بەڵام بەکورتی دەڵێین:

بێگومان سەرچاوە بوونی شەریعەت لەبواری حوکم و سیاسەتدا وێڕای پاراستنی تاك و کۆمەڵ لەو جۆرە لادان (انحراف)انەی کە لە کۆ مەڵگا نامسوڵمان و نائیسلامییەکاندا دەیانبینین وەك بە یاساییکردن (تقنین)ی: سوودخۆریی و داوێن پیسیی و نێربازیی و مەیخۆریی و قو مارو... هـ تد، کە هەموو عەقڵێکی ساغ و زانیارییەکی ڕاست دەزانێ کە زیانبەخشن و کۆمەڵگا گەندەڵ و پووچەڵ دەکەن و عەیـ بداریی دونـیاو گوناهـ باریی دوارۆژی بۆ مسۆگەر دەکەن، لەهەمان کاتیشدا دەستی خەڵکیش ئاوەڵا دەکات و ڕێ ی لەبەردەم دا تەخت و ئاچووغ دەکات کە لە هەموو ڕێیەکی

(13) بێگومان هیچ کاتێکیش شەریعەت لەگەڵ هیچ شتێکی چاك و سوودبەخش دا تێك ناگیرێ، وەك خوای زانا لەبارەی پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ﴿.. يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ﴾ (الاعراف-157)

وا تە: (.. فەرمانیان پێ دە کات بە هەموو چاکەیەك و ڕێ یان لێ دە گرێ لە هەموو خراپە یەك ، وە هەر چی پاك و چاکە بۆ یان حەڵاڵ دە کات و هەر چی پیس و ز یان بەخ شە لێ یان قەدە غە دە کات، وە باری قور سی سەر شان و کۆت و زنجیرەکاذ یان لادەبات....)

راستەوەو بە هەموو شێوازێکی چاك، چی خێرو قازانج و بەرژەوەندییەو مایەی بەختەوەری و سەرفرازیی دونیاو دوارۆژیەتی بۆخۆی دابینی بکات!

کەواتە: شەریعەتێکی ئاوا کاریەجێ وگشتگیرو سەربەخێرو بێ هەڵەو پەڵە،کە هیچ کەلێن و بۆشاییی بۆ غەیری خۆی نەهێشتوونەوە تاکو پڕیان بکاتەوە، ستەم و ناماقووڵییە هیچ شتێکی دیکەی لەگەڵ باس بکرێ و لەگەڵ تێکەڵ بکرێ!!

## (6) چوار تایبەتمەندیی گرنگی ئیسلام لەبواری حوکم و سیاسەتدا:

خوێنەری بەرِێز:

بێگومان ئایین و بەرنامەی تێروتەواو و بێ هەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێ لە هەموو بوارەکاندا کۆمەڵێك ئیمتیازو تایبەتمەندی خۆی هەن کە لە رێچکەو بەرنامەکانی دیکەدا چنگ ناکەون جا ئێمە لێرەدا باسی چوار لە تایبەتمەندیی و ئیمتیازەکانی ئیسلام دەکەین لەبواری حوکم و سیاسەتدا:

1-حوکم و سیاسەت وەك سەرجەم لایەنەکانی دیکەی شەریعەت راستەوخۆ پەیوەستە بە جیهانبینی و ئیمان و عەقیدەوە:

ئیسلام کە تاکە وەحی پارێزراو و دەستکاریی نەکراوی خوایە کە ئێستا لە بەردەستی بەشەردا مابێ و لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە خاوەنی تاکە جیهانبینی و عەقیدەی راست و دروستەو، جیهانبینی و عەقیدەش لە ئیسلام و غەیری ئیسلامیشدا بناغەی پابەندیی وکردەوەیە، چونکە هیچ هەڵسوکەوت (تصرّف)ێك بەبێ ریشەی تێروانین (تصوّر)ێك نایەتەدی، هەربۆیەش خوای زاناو شارەزا عزّو جل لەچەندان شوێنی قورئانێدا ئیمان وکردەوەی چاك (الایمان والعمل الصالح)ی پێکەوە باسکردوون بەشێوازی جۆراوجۆر، بۆ نموونە:

أ/ ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾ (الكهف -107)

ب/ ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ (النحل -97)

ج/ ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِ وَإِنَّا لَهُ كَاتِبُونَ﴾ (الأنبياء-94)

جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە شەریعەتی ئیسلامی بەگشتی بناغەکەی تاکە جیهانبینی و عەقیدەی راست و تەواوە دیارە ئەو راستیی و تەواویی یەی ئەو جیهانبینی و عەقیدەیە بۆتە هەوێن و هەناوی شەریعەت و ڕووحێك کە بەهەموو کون و قوژبن و وردو درشتێکیدا بڵاوبۆتەوە، ئەوە لەلایەك، لەلایەکی دیکە شەوە پەیوەستبوونی شەریعەت کە بەشێکی حوکم و سیاسەتە- بە ئیمان و عەقیدەوە دەبێتە مایەی زیاتر ڕێز لێگرتن و باشتر پابەندبوونی خەڵکی بە شەریعەتەوەو سەرپێچی لێ نەکردنی یان.

ئێستاش با بۆ چۆنیەتی پەیوەستبوونی شەریعەت بەگشتی و حوکم و سیاسەت بەتایبەت بە جیهانبینی و عەقیدەوە لە ئیسلامدا سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

* ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ (آل عمران-83)

واتە: ﴿ئایا بەرنامەی غەیری خوا دەخوازن! لە حاڵێكدا كە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەكان و زەویدان چاروناچار بۆی ملكەچ بوونە و هەربۆلای ویش دەگێڕرێنەوە؟!﴾

* ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاء بِنَاء وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ. هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ. قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَمَّا جَاءنِيَ الْبَيِّنَاتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (غافر-64، 65، 66)

واتە: ﴿خوا ئەو كەسەیە كە زەوی بۆ سەقامگیر كردوون و ئاسمانی بۆ كردوونە سەربان و وێنەی كێشاون جا زۆرباش وێنەتانی كێشاوە، وە لە رِۆزی یە پاك و چاكەكانی بۆ رەخساندوون ئا ئەوەتان خوای پەروەردگارتانە بەرزو شكۆدارە خوای پەروەردگاری جیهانەكان. ئەو زیندوویە جگە لەوی هیچ پەرستراو نین دەجا لێی بپارێنەوە و گەردن كەچیتانی بۆ ساغ بكەنەوە، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەكان. بڵێ من قەدەغەكراوم ئەوانە بپەرستم كە لە جیاتی خوا لێیان دەپارێنەوە دوای ئەوەی بەڵگە رۆشنەكانم لە پەروەردگارمەوە بۆ هاتوون وە فەرمانم پێكراوە كە گەردن كەچ بم بۆ پەوەردگاری جیهانەكان﴾.

* ﴿...أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ؟ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلاَّ أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ

إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (يوسف-39، 40)

واتە: ﴿ئایا چەند پەروەردگار(خاوەن و سەروەرو پەرستراو)ێكی پەرتەوازە باشترن -بپەرسترێن- یاخود خوای تاكی مل پێكەچكەر؟! ئەو شتانەی ئێوە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن هیچ نین جگە لە چەند ناوێك كە خۆتان و باپیرانتان ناوتان ناون و خوا هیچ بەڵگەیەكی لەسەریان نەناردۆتە خوارێ. بێگومان حوكم تەنیا هی خوایە فەرمانی كردوە كە جگە لەوی نەپەرستن، ئا ئەوە ئایینی راست و دروستە بەڵام خەڵكی نازانن.﴾

بەكورتی: یەكەمین ئیمتیاز و تایبەتمەندیی حوكم و سیاسەت لە ئیسلامدا ئەوەیە كە پەیوەستە بە تاكە جیهانبینیی و عەقیدەی راست و تەواوەوە، ئیسلام دەڵێ:

مادام تەنها خوا تبارك وتعالی بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگاری جیهانەكانە، پێویستە تەنها ئەویش بپەرسترێ و بەندایەتی بۆ بكرێ و پەیڕەوی لە شەریعەتەكەی بكرێ و، بێجگە لەوی هیچ كەس و لایەنێك مافی ئەوەی نیەو شایستەیی ئەوەی نیە، كە خەڵك بیكەنە پەروەردگارو پەرستراو و حاكمی خۆیان.

2- ئیسلام بەدیاری کردنی کۆمەڵێك حوکمی نەگۆڕ چوارچێوەیەکی ڕوون و مەحکەم بۆ حوکم و سیاسەت دادەنێ کە ڕێی لادان (انحراف)ی لێ بگرێ:

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

ئیسلام لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا کۆمەڵێك حوکمی شەرعی نەگۆڕی داناون لەبواری حەلاڵ و حەرامدا کە چوارچێوەو بازنەیەکی مەحکەم بۆ حوکم و سیاسەت پێك دێنن و ناهێڵن سەری لە لادان و هەڵدێرانەوە دەربچێ، بۆ وێنە:

أ/ لە بواری سیاسیدا:

1- ڕاوێژ (شوری) بناغەی کاروبار بەڕێوەبردنە: (..وامرهم شوری بينهم..) (الشوری -38) واتە: مسوڵمانان لەسەر بناغەی ڕاوێژ هەموو کارەکانیان ئەنجام دەدەن کە یەکیان دیاری کردنی مشوورخۆرو کاربەدەستیانە.

2- وە هەمیشە پێویستە مسوڵمانان مشوورخۆر و سەرپەرشتیاریان هەبێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ ..﴾ (النساء -59)

3- وە لەسەر مشوورخۆر و براگەورە فەرزە کە ڕاوێژ بە خەڵك بکات: ﴿..وشاورهم في الأمر..﴾ (آل عمران-159)

4- وە لەسەر خەڵکیش پێویستە کە بۆ مشوورخۆرانیان گوێ ڕایەڵ و فەرمانبەربن: ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ..﴾ (التغابن-16)

ب/ لە بواری ئابووریدا:

1- هەرکەسە بۆی هەیە لەبەری ڕەنجی خۆی بەهرەمەند بێت و خاوەنداریێتی تاکی ڕەوایە: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ ...﴾ (النساء-32)، ﴿...فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ ﴾ (البقرة-279)

2- بەڵام دروست نیە ماڵ و سامان و واریدات هەمووی یان زۆربەی لە دەستی چەند کەسێك دا پەزمەندە بکرێ لە سەر حیسابی خەڵك و جەماوەرو سەرمایەداریێتی(الرأسمالية) لە ئیسلامدا ڕێی پێ نادرێ: ﴿.. كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ ..﴾ (الحشر-7)، ﴿...قَالُواْ يَا شُعَيْبُ أَصَلاَتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاء ...﴾ (هود -87)

3- کڕین و فرۆشتن بەشێوازی شەرعییانە ڕەوایە بەڵام ماڵ و سامانی یەکدی بەناهەق خواردن بەگشتی و بەتایبەتی ڕیبا قەدەغەیە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ...﴾ (النساء -29)، ﴿...وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا...﴾ (البقرة-275)

**ج/ لە بواری پاریزگاری کردن لە ژین و ئاسایش و وەچەو ئابڕوو و سامانی خەڵکیدا:**

1- کەسێك بەناحەق یەکێك بکوژێ دەکوژرێتەوە: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (البقرة 178)

2- کەسێك هێمنی و ئاسایشی خەڵك بشێوێنێ چەند جۆرە سزایەك بە پێی تاوانەکەی ڕووی تێدەکەن: ﴿إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ (المائدة -33)

3- سزای داوێن پیسی (زینا) سەد قەمچییە: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور-2)

4- سزای بوختانی داوێن پیسی بۆ ئینسانی پاککردن هەشتا قەمچییە: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (النور-4)

5- سزای دزیی دەستبـڕینە: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (المائدة-38)

وە هەروەها لە سەرجەم بوارەکانی دیکەدا شەریعەتی دادگەرانەو کاربەجێی خوا کۆمەڵێك حوکمی نەگۆڕی ڕوون و بێ چەندوچوونی داناون کە دەبێ کۆمەڵگای ئیسلامیی بەگشتیو دەسەڵاتی سیاسی بە تایبەت پێیانەوە پابەند بێت و جێبەجێیان بکات، بەمەش ئیسلام چوارچێوە (اطار)یکی بۆ دەوڵەت و حکومەت داناوە کە ڕێی لادان و هەڵدێرانیان لـێ دەگرێو لەو سەرئەنجامە شوومە دەیانپارێزێ کە کیانو قەوارە غەیرە ئیسلامییەکان دووچاری دەبن بەهۆی پابەند نەبوونیانەوە بە چەند یاسایەکی نەگۆڕو ملکەچ بوونیان بۆ راوبۆچوون و ئارەزووەکانی خەڵکی یان هەندێك کەس و لایەن کە بە درۆو ساختەو چەواشەکاریی بە ناوی خەڵکەوە قسە دەکەن و بە ئارەزووی خۆیان و بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانیان حەرام حەڵاڵ و حەڵاڵ حەرام دەکەن(14)، خوای پەنهانبینیش فەرموویەتی: ﴿وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ بَلْ أَتَيْنَاهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ﴾ (المؤمنون-71)

(14) بۆ وێنە: داگیرکردنی وڵاتان و بەتاڵان بردنی خێروبێریان بەناوی رزگارکردنیان و بڵاوکردنەوەی دیموکراسییەوە، بەرەوا دانانی سوودخۆری کە خوێن مژینی خەڵك و جەماوەرە، بە رەوا دانانی نێربازی و پێکەوەنانی خێزانی هاوجیندسی کە پێچەوانەی عەقڵ و فیطرەتە...هتد.

3- ئیسلام گیانێكی مەعنەوی و ئەخلاقی بەبەر حوكم و سیاسەتدا دەكات تاكو لە وشكیی و سەركێشیی بیپارێزێ:

بەڵێ خوێنەری سەنگین!

لە ئیسلامدا هەموو شتێك تێكهەڵكێش و پێكەوە پەیوەستە وەك چۆن ژیانیش هەروایە، چا یەكی دیكە لە تایبەتمەندییەكانی سیستەمی حوكم و سیاسەت لە ئیسلامدا ئەوەیە كە گیانیكی مەعنەوی و ئەخلاقیی بەبەرداكراوەو كاتێك سەرنجی ئایەتەكانی قورئان و فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەین كە لەو بوارەدا هاتوون ئەو حاڵەتە بەزەقی هەست پێدەكەین، هەروەها لە حاڵەتی پراكتیزەكردنی حوكم و سیاسەتیشدا بەتایبەت لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و چوار جێنشینەكانی و عومەری كوڕی عبدالعزیزو ژمارەیەكی دیكە لە كاربەدەستانی مسوڵماناندا وەك: (نورالدین محمود)و(عمادالدین زنگـي)و (صلاح الدین)و (محمد الفاتح) -خوا لێیان ڕازی بێ- ئەو حاڵەتە زۆر چاك بەرجەستەكراوە.

ئێستاش با سەرنجی ئەم ئایەت و فەرمایشتانە بدەین وەك نموونە لەو بوارەدا:

- ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ (النساء-58)

- ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (القصص-83)
- ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا. أُوْلَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا. خَالِدِينَ فِيهَا حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾ (الفرقان-76،75،74)

وەك دەبینن:

- لە ئایەتی (58)ی(النساء)دا خوای بێهاوەڵ سەرەتا كۆمەڵگاو خەڵكی مسوڵمان دەدوێنێ و فەرمانیان پێدەكات كە سپاردە (أمانە)ەكان تەسلیمی خاوەنەكانیان بكەن دیارە گەورەترین سپاردەش مەسەلەی سەرپەرشتیكردنی مسوڵمانان و مشوور لێخواردنی دین و ژینیانە، پاشان روو دەكاتە كاربەدەست و دادوەرانی مسوڵمانان و فەرمانیان پێدەكات كە لەكاتی حوكم و دادوەرییكردن لە نێو خەڵكیدا دادگەرانە حوكم بكەن، پاشان بە هەردوو دوولایان دەفەموێ:

﴿إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾

واتە: بێگومان ئەوەی كە خوا ئامۆژگاریتانی پێدەكات چاكترین شتە بێگومان خوا هەر بیسەرو بینەر بووە .

* وە لە ئایەتی ژمارە(83)ی (القصص)دا خوای پەروەردگار ڕای دەگەیەنێ كە مەنزڵگای دوارۆژ تەرخان كراوە تەنیا بۆ كەسانێك

کە نایانەوێ لەسەر زەوی خۆ بەزلگریی و خرا پەکاریی بکەن، پاشان ڕای دەگەیەنێ کە سەرەنجامی چاك لەگرەوی پارێزکاران دایە.

* وە لەئایەتەکانی (74و75و76)ی (الفرقان )داو لە سیاقی چەند ئایەتێکدا کە مەدح و ستایشی بەندە هەڵبژاردەکانی خوایان تێدا دەکات و لە دوایین خەسڵەتیاندا دەفەرموێ: ﴿وە ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان! هاوسەران و وەچەمان بۆ بگێرە بەمایەی چاوڕوونی و دڵخۆشیمان وە بمانگێڕە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران﴾ پاشان ڕای دەگەیەنێ کە ئەوانە بە کۆشکەکانی بەهەشت پاداشتیان دەدرێتەوەو لەوێدا ڕێزیان لێ دەگیرێو سەلامیان لێدەکرێ .

پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەو بارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە:

1. (عن أبي ذر قال: قلت يا رسول الله ألا تستعملني؟ قال: فضرب بيده على منكبي ثم قال: ياأباذر انك ضعيف وانها أمانة وانها يوم القيامة خزي و ندامة الاّ مَنْ أخذها بِحقِّها وأدّى الذي عليه فيها) (رواه مسلم).

واتە: (أبوذر الغفاري) -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا کارو بەرپرسێتییەکم پێ نا سپێری؟ دە ڵێ: ئەویش دەست خستە سەرشانم و فەرمووی: ئەی أبوذر تۆ بێهێزی و بەرپرسێتیش سپاردەیە  دیارە سپاردەش دەبێ بە ئینسانی بەهێز بسپێردرێ  وە بەرپرسێتیش لەڕۆژی دواییدا مایەی سەرشۆڕیی و

پەشێمانییە مە گەر کە سێك بە هەق وەری گرتبێ و ئەرکی سەرشانی خۆیشی تێدا ئەنجام دابێ .

2. ((مامن راع يسترعيه الله يموت يوم يموت وهو غاش لرعيته الا حرم الله عليه الجنة)) (رواه البخاري و مسلم).

واتە: هەر بەرپرسێك خوا کارێکی بخاتە دەست و لەگەڵ ئەوانەی لە ژێر دەستیدان ناڕاست و ناپاك بێت، کاتێك کە دەمرێ بە تەئکید خوا بەهەشتی لــێ قەدەغە دەکات.

3. ((كلكم راعٍ وكلكم مسئول عن رعيته: الامام راعٍ و هو مسئولٌ عن رعيته ...)) (رواه البخاري ومسلم واحمد).

واتە: هەرکامێکتان چاودێرە و بەرپرسیشە بەرانبەر خەڵکەکەی: پێشەوا سەرکردە- چاودێرە و بەرپرسیشە لەبارەی خەڵکەکەیەوە. (واتە: خوا لەسەروان لێی دەپرسێتەوە دا خۆ چۆن بووە و چی کردوە؟).

4. (من ولي من امر المسلمين شيئاً فولى رجلاً وهو يجد مَنْ هو أصلح للمسلمين منه فقد خان الله و رسولَهُ) رواه الحاكم.

واتە: هەرکەسێك لە کاروباری مسوڵمانان بەرپرسێتییەکی پێ بسپێررێ و ئەویش پیاوێك بکاتە بەرپرسی کارێك لە حاڵێکدا کە هی لەویش شایستەتر و چاکتر بۆ مسوڵمانانی پێ شك بێت، ئەوە خیانەتی بە خواو پێغەمبەرەکەی کردوە!

5. ((مامن امیر یلي أمر المسلمین ثم لایجهد لهم ولاینصح لهم الا لم یدخل معهم الجنة)) (رواه مسلم).
واتە: هەر بەرپرسێك كاری مسوڵمانان بە ئەستۆوە بگرێ پاشان خۆی بۆیان ماندوو نەكات و بۆیان دڵسۆز نەبێ ئەوە لە گەڵیان ناچێتە بەهەشت.

4- ئیسلام سەرجەم لایەنە ئیجابی یەكانی دیموكراسی تێدایەو لە لایەنە سەلبی یەكانیشی دوورە:
بەڵێ خوێنەری بەرێز!
دیموكراسی كە دەتوانین بڵێین: لەم رۆژگارەدا چاكترین یان كەم زیانترین سیستەمی حوكمڕانییە لەنێو سیستەمەكانی زادەی بیرو هۆشی مرۆڤدا، ئیسلام سەرجەم لایەنە چاك و ئیجابییەكانی بەڵام بەجۆرێكی چاكتر گرتوونە خۆی و لە كەموكوورییەكانیشی دوورە.
جا لەبەر ئەوەی ئێمە سوپاس بۆ خوا لە كتێبی: (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)دا[15] تا رادەیەك بە تێروتەسەلی باسی ئەم بابەتەمان كردوەو بەراوردمان لە نێوان دیموكراسی و سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامدا كردوەو لێرەش ئەو دەرفەتەمان نییە بۆیە خوێنەر حەواڵەی ئەوێ دەكەین و لێرەدا هەر بەكورتی دەڵێین:

(15) بڕوانە: ئاڵقەی -5- (دیموكراسی لەبەر تیشكی عەقل و شەرع دا) لاپەڕە241تا292.
وە بڕوانە: (دیموكراسی و دیكتاتۆریی و هەڵوێستی ئیسلامی یانە) لاپەڕە 293 تاكو 356، چاپی پێنجەم، نووسینگەی تەفسیر،2005ز.

دیموکراسی چوار بنەمای گرنگ و سەرەکی هەن کە ئەمانەن:
أ- باڵا دەستیی گەل .
ب- سەروەری یاسا .
ج- مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان.
د- لە یەك جیاکردنەوەی سێ دەسەڵاتەکانی یا سادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی.
سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامییش حەوت بنەمای گەورەو گرنگی هەن کە ئەمانەن:
1- حوکمڕانێتی باڵا هی خوایەو سەروەریی هی شەریعەتی خوایەو هیچکەس مافی لێلادانی نیە.
2- دەسەڵات هی خەڵك و کۆمەڵگایەو لە سنووری شەریعەتدا دەستی والایە.
3- راوێژ بناغەی کاروبار بەڕێوەبردنە لەهەموو ئاست و بوارەکاندا.
4- خەڵکی بۆدابینکرانی ڕێزو ماف و ئازادییەکانیان یەکسانن.
5- فەرمانبەریی تەنها لە سنووری تواناو لە جوغزی شەرع دایە.
6- چەسپاندنی دادگەریی و دوورخستنەوەی زیانەکان و دابینکردنی بەرژەوەندییەکان ئامانجی سەرەکییە.
7- فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپەو هەقبێژیی و چاودێرییکردنی دەسەڵات و راستکردنەوەی ماف و ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکە.

ئەمـەش چەند دەقێكی قورئان و سوننەت لەسەر ئەو حەوت بنـەما گەورەو گرنگانەی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامی:

**بنەمای یەكـــەم:** حوكمڕانێتی باڵا هی خوایەو سەروەریی هی شەریعەتی خوایە... وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

1- ﴿ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلاَّ أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ (يوسف-40)

2- ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (الشورى-21)

3- ﴿ أَفَغَيْرَ اللّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنَزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلاً وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ﴾ (الأنعام -114)

**بنـەمـای دووەم:** دەسەڵات هی خەڵك و كۆمەڵگایە... وەك خوای كاربەجێ فەرموویەتی:

1- ﴿ إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴾ (النساء-58)

بە پێی سیاقی ئایەتەكانیش دیارە كە دوێنراو(مخاطب) لێرەدا خەڵك و كۆمەڵگای مسوڵمانەو مەبەستیش لە سپاردەكان

(الامانات) ئەرك و کارەکانی بەرپرسیارێتی و مشوور لێ خواردنی کۆمەڵگایە.

2- ﴿...أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ...﴾ (الشورى-13)

دیارە دوێنراو لێرەش هەر کۆمەڵگای مسوڵمانە کە خوا فەرمانی پێکردوە ئایین و بەرنامەی خوا بەرپا بکات و ئاییینیش بەبێ کیان و دەسەڵاتی سیاسی بەرپا ناکرێ، کەواتە: کۆمەڵگای مسوڵمان خاوەن حەقی ئەسڵی یە لە بواری حوکم و سیاسەتدا.

3- ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور-2)، ﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (المائدة-38)، ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقَيرًا فَاللّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ وَإِن تَلْوُواْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ (النساء-135)

ئاشکرایشە کە ئەو دواندن (خطاب)ە قورئانی یانەو هاوێنەکانیان هەموویان ڕوویان لە کۆمەڵگای مسوڵمانە بە پلەی یەکەم، کەواتە کۆمەڵگای ئیسلامیی خاوەنی دەسەڵاتی شەرعی یەکەمەو بەرپرسیاری یەکەمیشە لە بەرانبەر دین و شەریعەتی خواو پیادەکردنیاندا.

**بنـەمای ســێــیەم:** راوێژ بناغـەی كاروبار بەڕێوەبردنە... وەك خوای بەرزو بێهاوتا فەرموویەتی:

1- ﴿.. وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ ...﴾ (الشورى-38)

واتە: ﴿... وە كاروبارییان لە نێوخۆیاندا بەراوێژە...﴾.

2- ﴿...وشاورهم في الامر..﴾ (آل عمران-159)

واتە: ﴿... وە لە كاروباردا راوێژیان پێ بكە...﴾.

3- ﴿...وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ...﴾ (الطلاق-6)

واتە: ﴿... وە لەنێو خۆتاندا بەشێوەیەكی چاك و بەمەبەستی چاك راوێژ بكەن...﴾.

**بنەمـای چـوارم:** خەڵك لە: بۆ دابینكرانی رێزو ماف و ئازادییەكانیاندا یەكسانن... وەك خوا فەموویەتی:

1- ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ (البقرة-30)

2- ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ (الإسراء-70)

3- ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الجاثية-13)

4- ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ (الأعراف-32)

5- ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ؟!﴾ (يونس-99)

6- ﴿لا إكراه في الدين...﴾ (البقرة-257)

لەم ئایەتە بەپیزانەدا بەروون و راشکاویی راگەیەنراوە:

1- ﴿ئینسان جێنشینی خوایە لەسەر زەوی﴾ (البقرة-30)

2- ﴿ئینسانەکان بەگشتی خوا ریزی لیناون...﴾ (الاسراء-70)

3- ﴿خوا هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی دایە بۆ خەلکی بەگ شتی مەیسەر و رام کردوە﴾ (الجاثیة-13)

4- ﴿وە هیچ کەس مافی قەدەغەکردنی نیعمەتەکانی خوای نیە لە بەندەکانی چونکە، هەر بۆوانی رەخساندوون﴾ (الأعراف-32)

5- ﴿وە هیچ کەس بۆی نیە هیچ فیکرە و بۆچوون و دین و بەرنامەیەك لەسەر خەلکی فەرز بکات﴾ (یونس-99)، وە (البقرة-256)

<u>**بنەمای پێنجەم:**</u> فەرمانبەریی تەنها لە سنووری تواناو لە چوغزی شەرع دایە: وەك خوا تبارك وتعالی فەرموویەتی:

1- ﴿لايكلف الله نفساً الا وسعها...﴾ (البقرة-286)

2- ﴿فاتقوا الله مااستطعتم واسمعوا وأطيعوا...﴾ (التغابن-16)

3- ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (الممتحنة-12)

4- ﴿انما الطاعة في المعروف﴾ (رواه البخاری ومسلم).

5- ﴿على المرء المسلم السمع والطاعة فيما احب وكره الا أن يؤمر بمعصية فأذا أمر بمعصية فلا سمع ولاطاعة﴾ (رواه البخاري و مسلم).

لەم ئایەت و فەرمایشتانەشدا زۆر جوان درەوشاوەتەوە کە گوێڕایەڵی و فەرمانبەریی خەڵك بۆ دەسەڵاتی سیاسی تەنها لە سنووری تواناو لە بازنەی شەریعەتدا فەرزە، ئەگەرنا لەوە بەولاوە نەك فەرز بەڵکو هەر دروستیش نیە.

**<u>بنەمای شەشەم:</u> چەسپاندنی دادگەریی و دوورخستنەوەی زیانەکان و دابین کردنی بەرژەوەندییەکان ئامانجی سەرەکییە.**

ئەمیش چەندان دەقی قورئان و سوننەت دەلالەتی لەسەر دەکەن بۆ نموونە:

1- ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ (الحديد-25)

2- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ (المائدة-8)

3- ﴿وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ﴾ (الشورى-15)

4- ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (النحل-90)

5- ﴿وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الفَسَادَ﴾ (البقرة-205)
6- ﴿النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ﴾ (الأعراف-157)

**بنەمای حەوتەم:** فەرمان بە چاكەو رێگریی لە خراپەو حەقبێژی و چاودێریكردنی دەسەلآت و راستكردنەوەی، مافو ئەركی سەرشانی هەموولایەكە.

لەو بارەشەوە ئایەتی خوا (عزوجّل)و فەرمایشتی پێغەمبەری پێشەوا زۆرن، بۆ نموونە:

1- ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ...﴾ (التوبة-71)
2- ﴿لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُدَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ. كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾ (المائدة-79)
3- ﴿وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (الأنفال-25)

وەك لەم ئایەتانەدا دەبینین خوای بەرزو مەزن یەكەمین سیفەت كە ئەهلی ئیمانی بە نێرومێ وە پێ وەسف دەكات ئەوەیە كە: فەرمان بە چاكەو رێگری لە خراپە دەكەن! (التوبة-71)، وە

هەواڵمان پێدەدا کە هــەرکام لە(داوود)و (عیسا)ی کوڕی مەریەم -سەلامی خوایان لێبێ- نەفرینیان لە بەنی ئیسرائیلییە کافرەکان کردوە بەهۆی ئەوەوە کە یەکدییان نەگێڕاوەتەوە لە خراپەو ناشەرعی، وە خوا ئەو خەسڵەتەی بەنی ئیسرائیل بە خراپترین ڕەفتار دادەنێ، (الانفال-25).

فەرمایشتی پێغەمبەریش لەوبارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

1- ڕۆژێکیان (ابوبکر) -خوا لێی ڕازی بێ- لەکاتی وتاردانیدا بە خەڵکی گوت: ((أيهاالناس! انكم تقرؤن هذه الآية وتؤولونها على خلاف تأويلها: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ واني سمعت رسول الله ﷺ يقول: ان الناس اذا رأو الظالم فلم يأخذوا على يديه أوشك أن يعمهم الله بعقابٍ منه)) -رواه الترمذي-.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە بەڵام بە هەڵەو پێچەوانەوە لێکی دەدەنەوە: ﴿ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە لە خۆتان وریابن ئەگەر ڕێی ڕاست بگرن ئەوانەی گومڕان زیانتان لێنادەن!﴾ (المائدة-105)، بەڵام من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستوە دەیفەرموو: هەرکات خەڵکی ستەمکاریان بینی و دەستیان نەگرت و لە ستەمیان نەگێڕایەوە، نزیکە خوا بەگشتی سزایان بدات.

2- ((من رأى مكنم منكراً فليغيره بيده فأن لم يستطع فبلسانه فأن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الايمان)) (رواه مسلم والترمذي وغيرهما).

واتە: هەرکامێکتان خراپەیەکی بینی با بەدەست بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی بە زمانی، ئەگەر نەیتوانی با بەدڵ دژی بوەستێ و ئەوەش بێهزترین ئیمانە.

3- (ان من أعظم الجهاد كلمة عدلٍ عند سلطانٍ جائرٍ) رواه الترمذي.

واتە: بێگومان لەگەورەترین جۆری جیهاد قسەیەکی دادگەرانەیە لە لای حوکمڕانێکی ستەمکارو لار.

4- (خير الشهداء حمزة ثم رجلٌ قام الى امامٍ فأمرهُ ونهاه في ذات الله تعالى فقتلهُ على ذلك) أخرجه الحاكم.

واتە: چاکترین شەهید حەمزەیە، ئینجا پیاوێکە هەڵدەستێو لە پێناوی خوای بەرزدا فەرمان بە چاکەو رێگریی لە خراپە لەگەڵ پێشەوایەکدا دەکات و لەسەر ئەوە دەیکوژێ.

5- (اذا رأيت امتي تهاب الظالم أن تقول له: انك أنت الظالم، فقد تودع منهم) -رواه احمد-.

واتە: هەرکات ئوممەتمت بینی دەترسا کە بە ستەمکار بڵێ: تۆ ستەمکاری! ئەوە ماڵئاوایی لێکراوە و حیسابی رۆیوە!

لەکۆتایی ئەم باسەشدا دەڵێم:

وەك بینیمان سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلام کاکڵ و جەوهەری لایەنە ئیجابییەکانی سیستەمی دیموکراسی تێدایەو بەشێوەیەکی چاکتریش، وە هەندێك شتی تێدایە کە لە دیموکراسی دانیە کە گرینگترینیان دیاری کردنی چوارچێوەیەکە بۆ سیستەمی حوکمڕانیی بەهۆی حەڵاڵ و حەرامە روون و نەگۆڕەکانی شەریعەتەوە کە ئەوەش سیستەمی حوکمڕانیی لەو

جۆرە لادان (انحراف)انە دەپارێزێ كە لە ئەنجامیاندا خەڵك و جەماوەر دووچاری مەینەتی و دەردی بە ئێش وگورچك بڕ دەبێ، وەك ئێستا دەبینین كە كۆمەڵگا رۆژئاواییەكان لە زۆر ڕووەوە گیرۆدەی گەندەڵیی و لادان و خلیسكانی وا بوون تەواو لە عەقڵ و فیطرەت دووری خستوونەتەوەو هەرچەندە لە ڕووی ژیانی ماددییەوە لەپێشن بەڵام هەتا بڵێی لە ڕووی ئینسانیی و ئەخلاقی و مەعنەویی و كۆمەڵایەتییەوە كلۆڵ و لە پاشن!

## (7) ڕوونکردنەوەی ڕاستییەك و ڕاستکردنەوەی هەڵەیەك

لەم ڕۆژگارەداو لە لایەن دامودەزگاکانی ڕاگەیاندنی دەستی تەوژمی سیکۆریزمەوە بۆ پێناسەکردنی تەوژمی ئیسلامیی تەعبیرێکی هەڵە بەکاردێ، کە خەریکە ببێتە زاراوەیەکی سیاسی باو! ئەویش بریتیە لە (ئیسلامی سیاسی).

چۆنیەتی هەڵە بوونی ئەم وشەیەش بەجۆرەیە:

ئاشکرایە کە مەبەست لەم وشەیە تەوژمی ئیسلامییە و تەوژمی ئیسلامیش لەو مسوڵمانانە پێکهاتوە کە هەوڵی ئەوە دەدەن و کردو کۆششی ئەوە دەکەن کە ژینی خۆیان و خەڵکە مسوڵمانەکەیان بە پێی دینی ڕاست و دروستی خواو ڕێبازی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێك بخەن، کەواتە بەکارهێنانی ئەم وشەیە بۆ تەوژمی ئیسلامی لە دوو سەرەوە هەڵەیە:

یەکەم: چونکە ئەگەر مەبەستیان لە (ئیسلامی سیاسی) خودی ئیسلام بێ، دیارە ئەم وشەیە ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە چەند جۆرە (ئیسلام)ێکمان هەبن و یەکێکیان ئیسلامیی سیاسی بێت! کە دیارە ئەوەش هەڵەیە، چونکە ئیسلام تەنها یەکێکەو زیاتر نیە: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ ...﴾ (ال عمران-19)، وە سیاسەت و حوکم بەشێك و لایەنێکی ئیسلامە، وەك چۆن هەرکام لە ئیمان و عیبادەت و تەقواو تەزکیەو جیهادو ئەخلاقی بەرزو .. هتدیش چەند بەش و لایەنێکی دیکەینی و بە هەموویان ئیسلام پێك دێنن!

دووەم: وە ئەگەر مەبەستیشیان پێی ئەو مسولْمانانە بن کە تەوژمی ئیسلامی(التیار الاسلامی) پێك دێنن، دیسان هەڵەیە، چونکە مسولْمانانێك کە تەوژمی ئیسلامی دێنن، کاری سیاسی و چالاکی سیاسی یەکێکە لە کارو چالاکییەکانیان و، کاری ئیسلامی کارێکی گشتگیرو فرە رەهەندەو لە بواری سیاسیدا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵکو سەرجەم بوارەکانی: فیکری و عەقیدەیی وکلتووریی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و ئەخلاقی وئیداری و ... هتد دەگرێتەوە، ئنجا ئەگەر گریمان مسولْمانێك یان کۆمەڵە مسولْمانێکیش هەبن تەنیا بۆ کاری سیاسی خۆیانیان یەکلایی کردبێتەوە، دیسان دروست نییە و شەی (ئیسلامی سیاسی) بکرێتە پێناسیان، چونکە وەك گوتمان، ئیسلام تەنها یەك ئیسلامە نەك زیاتر، وە ئەوەش کە دەجووڵێ و چالاکییە سیاسییەکە ئەنجام دەدات خودی ئیسلام نییە، تاکو کارە کەی پاڵبدرێتەلا، بەڵکو بابای مسولْمانە، بۆیە راست ئەوەیە بگوترێ: (مسولْمانی سیاسی) یان (مسولْمانانی سیاسی) وەك چۆن بە مسولْمانێك کە نوێژ دەکات یان رۆژوو دەگرێ یان زانیاری و شارەزایی هەیە یان جەنگ و جیهاد دەکات یان پارێزکاریی (تقوی)ی هەیە هتد دەگوترێ: مسولْمانی نوێژکەر، مسولْمانی رۆژووگر، مسولْمانی زاناو شارەزا، مسولْمانی جەنگاوەر موجاهید، مسولْمانی پارێزکاری (متقی)..

ئینجا ئەگەر بمانەوێ مسولّمانێك یان مسولّمانانێك کە لە بواری کاروچالاکی ئیسلامییدا جولاّو و هەڵسووڕاون، جیابکەینەوە لە وانەی کە دانیشتوو و نەجولاّوو و هەڵخزاون ڕاست ئەوەیە کە بلّێین:

مسولّمان یان مسولّمانانی مشورخۆرو ئیشکەر، یان جوولاّو و چالاك، یان کاراو گورج و گۆڵ..

وەك چۆن خوای کاربەجێ مسولّمانانی جەنگاوەرو تێکۆشەری ناو ناوە: (المجاهدين) وە ئەوانەش کە بەبێ عوزرو بەڵگە دادەنیشن و خەبات و فیداکاری لە پێناوی خوادا ناکەن ناوی ناون (القاعدين) وەك فەرموویەتی: ﴿ لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُـلاًّ وَعَدَ اللّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ (النساء -95)

واتە: ﴿بڕوادارانی دانیشتووی بێ عوزرو تێکۆشەران بە سامان و گیانیان لە ڕێی خوادا وەك یەك نین، خوا پلەیەك تێکۆشەران بە سامان و گیانیانی بەسەر دانیشتواندا بەرزکردۆتەوە، وە گفتی -پاداشتی- چاکی بە هەمویان داوە، وە خوا تێکۆشەرانی بەسەر دانیشتواندا بە پادا شتێکی گەورە بەرزکردۆتەوە﴾ .

کورتەی قسان:

ئەگەر بویسترێ تەوژمی ئیسلامیی بە شێوەیەکی ڕاست و واقیعی یانەو مەنتیقییانە پێناسە بکرێ، دەبێ بگوترێ: (مسولّمانانی مشوورخۆرو جولاّوو، یان مسولّمانانی تێکۆشەرو ئیشکەر)

ئینجا ماوەتەوە ئەوە كە بزانین ئایا پاڵنەرو هاندەری خەڵكی عەلمانیی چی یە كە تەوژمی ئیسلامیی و ئیسلامییەكان بە: (ئیسلامیی سیاسی) ناوزەد دەكەن و دەیانەوێ بەو وشە داهێنراوە پێناسەیان بكەن!

پێم وایە هەڵێنانی ئەو مەتەڵەو وەڵا می ئەو پر سیارەش شتێكی زەحمەت نیە چونكە هەر لە لابەلای قسەوقاڵی سیكۆلاریستەكان خۆیاندا زۆر بەڕوونی دیارە كە مەبەستیان لەو جۆرە ناوزەدكردن و پێناسەكردنەی تەوژمیی ئیسلامیی و ئیسلامییەكان ئەوەیە كە:

تۆمەتباریان بكەن بەوە كە تاكە ئا مانج و مەبە ستیان لە كارو چالاكی ئیسلامییان ئەوەیە كە بگەنە كورسی حوكمڕانیی و دەستیان لە سامان و دەسەڵات (الثروة والسلطة) گیربێت و پێیان بە ئاوات بگەن!

بۆیەش دەڵێم: ئەم تۆمەتباركرد نەی ئیـ سلامیی و ئیـ سلامییەكان ئامانجی سیكۆلاریستەكانە كە خۆیان و كاروچالاكییە ئیـ سلامییەكەیان بە (ئیسلامیی سیاسی) ناوزەدو پێناسە دەكەن، چونكە:

چەندان جار بە موناسەبەو بەبێ موناسەبە ئەو جۆرە قـ سەو بـاس و تۆمەتباركردنەیان لـێ بیـ ستراوەو ئە گەر بـ ڵێم بەدەگـ مەن بابا یەكی عەلمانیی هەیە ئەو قـ سەیەی دەر هەق بە ئیـ سلامییەكان نەكردبێ، زیادەڕۆییم نەكردوە.

جا ئێستا بە پێوی ستی دەزانم سێ هەڵوە ستە لە بەردەم ئەو مەسەلەیەدا بكەم:

**یەكـــەم:** پێشینان گوتوویانە: (هەركەسە لە هەمبانەی خۆیدا گوێزان دەژمێرێ!) هەروەها گوتوویانە: (دز پێی وایە هەمووكەس دزە!) جا

لە ڕاستیدا ئەو جۆرە تێڕوانینەی سیکۆلاریستەکانیش بۆ تەوژمیی ئیسلامیی و هەڵسووڕاوانی مەیدانی کاری ئیسلامیی، زیاتر لە(خۆ)وە سەیری (خەڵك)کردن و لە هەمبانەی خۆدا گوێز ژماردن و خەڵك لەسەر خۆ قیاسکردن (القیاس علی النفس)ەو ئەو جۆرە کەسانە لە سۆنگەی ئەوەوە کە ژیان بە ماددەی ڕووت و دونیاش بەتاکە هەل و دەر فەتی ڕابواردن و گوزەران دەزانن و ئەوەی لە فەرهەنگی مێشك و دەروونیاندا حیسابی بۆ نەکرێ و بوونی نەبێ، خواو قیامەت و ڕووح و... هتد، پێیان وایە کە خەڵکی دیکەش هەمووی هەر وەك وانەو، ئەوەی کە پاڵ بە خەڵکەوە دەنێ و هانیان دەداو دەیانجووڵێنێ لە تێکڕای هەڵسوکەوت و جموجۆڵەکانیاندا تەنیاو تەنیا ماددەو گەدەو داوێن و گیرفانە!

جا سیکۆلاریستەکانی ڕۆژگاری ئێمە لەو مەسەلەیەدا وەنەبێ شتێکی تازەو بێ‌پێشینە بن، بەڵکو سەرجەم هاوفیکرەو مەسەلەکانیان بە درێژایی مێژوو هەمان هەڵوێستیان هەبووە، ئەوەتا قسەڕۆیشتووە خۆبەزلگـــرو خۆشگوزەرانەکانی گەلـی (نوح) -علیه السلام- کاتێك نووح پێیان دەفەرموێ: (ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن جگە لەو هیچ پەرستراوتان نین، بۆچی پارێز ناکەن! ﴿يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ أَفَلاَ تَتَّقُونَ!﴾ (المؤمنون-23) نەیارو ناحەزانی بانگەوازە پڕ دادەکەی، ئاوا خەڵك کە چەو سێنراوەو بەش مەینەتەکەیان دەدوێنن: ئەم نووح-ە تەنیا مرۆڤێکی وەك خۆتانەو

دەیەوێ خۆتان لەسەر فەرز بکات...! ﴿فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَوْمِهِ مَا هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ...﴾ (المؤمنون- 24)

ئاخر پێغەمبەری خوا (نووح) -علیه السلام- وەك تێکڕای پێغەمبەران -علیهم السلام- خوا بۆ ئەوەی رەوانە کردوە کە گەلە ستەمدیدەو چەوسێنراوەو سامان و دەسەڵات لێ زەوت کراوە کەی رزگار بکات و لە ژێر نیری ئەشرافە خۆفەرزکەرو خۆ شگوزەرانەکان (الملأ المستکبرین والمترفین) دەربیان بێنێ، کە چی دەسەڵاتدارە ساماندارو خۆفەرزکەرەکانیان ئاوا راستییەکان لە خەڵکە داماوەکە هەڵدەگێرنەوەو چەواشەی دەکەن، بەوجۆرە وێڕای هەردوو چەکی:

سامان و دەسەڵات (الثروة والسلطة) چەکی سێیەمی راگەیاندن (اعلام)یش لە دژی بانگەوازی هەقی پێغەمبەران دەخەنەکار تاکو بەو سێکوچکە (الثالوث) شوومە دریژە بەکاری خۆیان بدەن و سەربارەش (نووح) پیاوخراپ دەربێنن و خۆشیان پیاوچاك و دڵسۆزو بە پەرۆش بۆ خەڵك و وڵات پێشان بدەن!!

**دووەم:** هەرچەندە هەرکەسێك بەراستی ئیمانی بە خواو بە رۆژی دوایی هەبێت، نەك تەنها لە مەیدانی چالاکی و کاری سیاسیدا بەڵکو لە سەرجەم جموجۆڵ و هەڵسوکەوتە تاکیی و خێزانیی و گشتییەکانیدا تاکە مەبەستی رازیکردنی خواو وەدەست هێنانی بەهەشت و پارێزران لە دۆزەخ دەبێ و، جگە لە بەرجەستەکردنی بەندایەتی بۆ خوا لە ژیانی تاکیی و کۆمەڵایەتیدا هیچ هاندەرێکی دیکەی نابێت، وەك خوای زاناو شارەزا (عزّو جل) لە وەسف و پێناسەی هاوەڵانی

پێغەمبەری خوا ﷺ و شوێن كەوتووانی ڕاستەقینەیدا فەرموویەتی: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ (الفتح- [illegible])

بەڵام ئایا ئەگەر گریمان بابایەكی مسوڵمان و لایەنێكی ئیسلامیی وەك ئەنجامدانی بەشێك لە ئەركی سەرشانی هەوڵی ئەوە بدات كە كۆمەڵگایەكەی لە خراپەوە بۆ چاكەو لە زوڵمەوە بۆ دادگەریی و لە ترس و بیمەوە بۆ هێمنیی و ئاسیش و لە ناتەبایی و فەرق و جیاییەوە بۆ برایەتی و تەبایی و... هتد ببات، ئایا چ خراپەو نا شەرعییەكی تێدایە؟!!

ئایا بۆچی ئەگەر خەڵكی عەلمانی و نائیسلامیی مشووری وڵات و خەڵك بخۆن و هەوڵی پاك سازیی و چاك سازیی تێداكردنی بدەن، كارێكی ڕەوا و پەسندە، بەڵام ئەگەر كەسانی ئیسلامیی بیكەن دەبێ بۆیان بەشتێكی خراپ دابنرێ و وەك تاوان (جریمة)یێك پێی تۆمەتبار (متهم) بكرێن؟! ئایا ئەمە جگە لە (بانێكەو دوو هەوا) و بە دوو جۆرە پێوان (الكیل بمكیالین) پێناسەیەكی دیكە هەڵدەگرێ؟!

**سێیەم:** جێی سەرنج ئەوەیە كە ئەو جەنگە دەروونییەی تەوژمی ناحەزو نەیار بە ئیسلام و ئیسلامییەكان كە بریتییە لە تۆمەتباركردنی

ئیسلامییەکان بەوەی کە ئامانجی سیاسی و دونیایی لە پشت کارە ئیسلامییەکەیانەوە هەیە! وەك ئەوەی کارکردن بۆ چاککردنی خەڵك و پاك سازیی و چاك سازیی کردنی کۆمەڵگا کارێکی خراپ و ناشەرعیی و نارەوابێت و تۆمەتێکی وابێت ئینسانی پێ بچێتە قەفەزی تۆمەتبارییەوە! بەڵێ جێی سەرنج ئەوەیە کە ئەو جەنگە دەروونییە کەم و زۆر کاری کردۆتە سەر هەندێك لە هەڵسووڕاوانی مەیدانی کارو چالاکی ئیسلامیی و کلاوی فێڵی عەلمانییەکانیان چۆتە سەرو گەلێك جار جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەوان بە هیچ جۆرێك نیازی هێنانە دی ئامانجی سیاسی و بەدەستەوە گرتنی جڵەوی حوکم و دەسەلات و بنیاتنانی کۆمەڵگاو کیانێکی ئیسلامییان نەبووە و نیە!!

جا بێگومان ئەو جۆرە هەڵوێستەی ئەو جۆرە کەسانە هەڵەیەو لە تەڵەو داوی ناحەزانی ئیسلام کەوتنە، گومانیشم لەوەدا نییە کە سیکۆلاریستەکان زۆریان دڵ پێخۆشەو کەیفیان پێدێ، جا چۆن کەیفیان پێ نایەت و لە قەلبیان خۆش نایەت، ئەدی ئەوە نیە فێڵ و پیلانەکەیان سەری گرتوەو جەنگە دەروونییەکەیان بەری گرتوەو نەیارەکانیان بە مەسرەفێکی کەم مەیدانیان بۆ چۆڵ کردوون و لایەنێکی گەورەوگرنگی ئایین و بەرنامەی خوای کاربەجێیان دەست لێهەڵگرتوە، کە بریتیە لە کارو چالاکی سیاسی و هەوڵدان بۆ ئاراستەکردن و رێکخستن و بەرێوەبردنی ژیان و گوزەرانی خەڵك بەپێی هیدایەت و شەریعەتی خوا؟!

بە پێویستیشی دەزانم لە کۆتاییی ئەم باسەدا چەند ئایەتێکی قورئان و چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)و کۆمەڵە قسەیەکی هەندێك لە زانایان و پێشەوایانی ئیسلام بێنم لە بواری سیاسەت و حوکمڕانییدا تاکو بۆ هەموولایەك چاك ڕۆشن بێتەوە کە حوکم و سیاسەت لایەنێکی گرنگی ئیسلامەو سەرگەرم بوونی مسوڵمانانیش بە لایەنی سیاسییەوەو چۆنیەتی ئاراستەکردن و ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەرانی خەڵك بەپێی شەریعەتی تێروتەواو و گشتگیری خوا نەك هەر مافێکی ڕەواو ئاسایی، بەڵکو ئەرکێکی شەرعیی گەورەوگرنگی سەرشانیانەو بە کەمتەرخەمی تێداکردنی گوناهبارو دووچاری تۆڵەو سزای دوارۆژ دەبن:

- ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ (التوبة - ).

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە پێغەمبەرەکەی بە ڕێنمایی و بەرنامەی ڕاستەوە ناردوە تاکو بەسەر هەموو بەرنامەیەکدا سەری بخات، هەرچەندە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش پێیان ناخۆش بێ.

- ﴿...فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكل جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا...﴾ (المائدة- ).

واتە: ... دەجا بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار حوکمیان لە نێودا بکەو شوێن ئارەزووەکانیان مەکەوەو لەو هەقەی بۆت هاتوە لامەدە، بۆ هەرکام لە (ئوممەتان)تان ڕێبازو بەرنامەیەکمان داناوە... .

- (كانت بنو اسرائيل تسوسهم الانبياء كلما هلك نبـيٌ خلفه نبـي وانه لا نبـيٌ بعدي وستكون خلفاء فيكثرون) (رواه البخاري ومسلم وابن ماجة واحمد عن أبي هريرة).

واته: وەچەی ئیـسرائیل (یعـقوب علـیه الـسلام) پێغەمـبەران سەرپەرشتی كاروبارییانیان دەكرد هەر كە پێغەمـبەرێك دەمرد پێغەمبەرێكی دیكە شوێنی دەگرتەوە، بەڵام دوای من چ پێغەمبەر نین بەڵكو جێنشینەكان دەبن و زۆریش دەبن...

- ((من خلع يداً من طاعة لقى الله يوم القيامة لا حجة له، و من مات وليس في عنقه بيعة مات ميتة جاهلية)) (رواه مسلم عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما).

واته: هەركەسێك لە فەرمانبەرییی بچێتە دەرێ رۆژی قیامەتێ كە دەچێتە لای خوا هیچ بەڵگەیەكی پێ نابێ، وە هەركەسێك بمرێ و پەیمانی پێ شەوا-ێكی لە گەردندا نەبێ ئەوە مردنێكی نەفامانە مردووە. (چونكە لە سەردەمی نەفامێتیدا كەس بەكەس بوو).

- ((لايحل لثلاثة نفر يكونون بأرض فلاةٍ الا أمروا عليهم اَحدهم)) (رواه احمد عن عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما).

واته: ڕەوانییە بۆ سێكەسان كە لەسەر زەمینێكی چۆڵیش بن، یەكیان نەكەنە فەرماندەیان.

- ((ان الله یرضی لكم ثلاثة: ان تعبدوه ولاتشركوا به شیئاً، وان تعتصموا بحبل الله جمیعاً ولا تفرقوا، وان تناصحوا من ولاه الله امركم)) (رواه مسلم) .

واتە: بێگومان خوا سێ شتی بۆ پەسەند كردوون:
كە بیپەرستن و هیچ شتێك نەكەنە هاوبەشی، وە تێكڕا دەست بە ڕێسمانی خواوە بگرن و پەرتەوازە نەبن، وە كە دڵ سۆز بن بۆ هەركەسێك كە خوا جڵەوی كاروبارتانی خستە دەست.- مادام بە شێوەی شەرعیی حوكمی گرتبێتە دەست و بە پێی شەرعیش حوكمڕانیی بكات-.

- ((الا كلكم راعٍ وكلكم مسؤل عن رعیته فالامام الاعظم الذی علی الناس راعٍ وهو مسؤلٌ عن رعیته..)) (رواه البخاري عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما).

واتە: ئاگاداربن هەمووتان چاودێرن و هەمووتان بەرپرسیارن بەرانبەر بە خەڵكەكەتان، پێشەوای گەورە كە سەرپەرشتی خەڵك دەكات چاودێرە و بەرپرسیارە بەرانبەر بە خەڵكەكەی...

**ئەمەش كۆمەڵە قسەیەكی زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەوبارەوە:**

/ (ابوبكرالصدیق) خوا لێی ڕازی بێ لە كاتی كۆچی دوایی پێغەمبەری خوادا ﷺ گوتوویەتی:
((الا ان محمداً قد مات ولابد لهذا الدین ممن یقوم به) (الدولة الاسلامیة بین التراث والمعاصرة)) (د. توفیق الواعي، ص )

واته: ئاگادار بن موحەممەد مردوه ئەم ئایینەش دەبێ کەسێك هەبێ بەڕێوەی بەرێ.

(عمر بن الخطاب) خوا لێی رازی بێ گوتوویەتی:

((لا اسلام بلا جماعة ولا جماعة بلا اِمارة ولا اِمارة بلا طاعة)) (رواه الدارمي في مسنده).

واته: ئیسلام بەبێ کۆمەڵ (بوون) نابێ، کۆمەڵیش بەبێ فەرماندەیتی نابێ، فەرماندەیتیش بەبێ فەرمانبەریی نابێ.

(عثمان بن عفان) خوا لێی رازی بێ گوتوویەتی:

((ان الله يزع بالسلطان مالا يزع بالقرآن))، (جامع الا صول ج، ص).

واته: بێگومان خوا ئەوەی بەهۆی حوکمڕانەوە دەیگێڕێتەوە لە خراپە- بەهۆی قورئانەوە نایگێڕێتەوە.

(علي بن ابي طالب) -خوا لێی رازی بێ- لە وەڵامی قسەی چەواشەکارانەی خەواریجدا کە دەیانگووت(لا حكم الا لله) گوتی:

((الحكم لله، وفي الارض حكامٌ ولكنهم يقولون: لا امارة، ولابد للناس من امارة يعمل فيها المؤمنون ويستمتع فيها الفاجر والكافر ويبلغ الله فيها الاجل)) (المنصف، لابن ابي شيبة، ج- ص).

واته: حوکم هی خوایەو لەسەر زەویش حوکمڕان هەن، بەڵام ئەوانە دەڵێن: نابێ سەرۆکایەتی هەبێ! بەڵام حەتمەن دەبێ خەڵك حوکمڕانێکیان هەبێ، کە ئیماندا لەژێر سایەیدا کار(ی باش)

بکات و بابای خراپەکارو کافریش بگوزەرێنێ و خواش کاری خۆی بە ئەنجام بگەیەنێ.

/ (عبدالله بن عباس) خوا لێیان ڕازی بێ گوتوویەتی:

((الاسلام والسلطان اخوان لایصلح احدهما بدون صاحبه)) (کنز العمال، ج- ص).

واتە: ئیسلام و دەسەڵات و حوکم، بران هیچیان بێ ئەوی دی ناگونجێ.

/ (ابو حامد الغزالي) خوا لێی خۆش بێ گوتوویەتی:

((اعلم ان الشريعة اصلُ والملك حارسٌ، وما لااصل له فمهدومٌ وما لا حارس له فضائعٌ)) (الاقتصاد في الاعتقاد) ص- لابي حامد الغزالي). واتە: بزانە کە شەریعەت بناغەیەو حوکمڕانیی پاسەوانە، هەر شتێکیش بناغەی نەبێ رووخاوەو هەرشتێکیش پاسەوانی نەبێ فەوتاوە!

/ (ابن حزم الاندلسي) خوا لێی خۆش بێ گوتوویەتی:

((اتفق جميع اهل السنة وجميع المرجئة وجميع الشيعة وجميع الخوارج على وجوب الامامة وان الامة واجب عليها الانقياد لأمامٍ عادلٍ يقيم فيهم حكم الله)) (الفصل في الملل والنحل، ج- ص- لابن حزم الاندلسي).

واتە: تێکڕای ئەهلی سوننەت و سەرجەم مورجیئەکان و هەموو شیعەکان خەواریجەکانیش بێ هەڵاواردن، لەسەر ئەوە رێک کەوتوون

که سەرۆکایەتی و پێشەوایەتی فەرزەو لە سەر ئو ممەت پێوی ستە ملکەچ بێ بۆ پێشەوایەکی دادگەر کە حوکمی خوایان ت یدا بەرپا دەکات و - شەریعەتیان بەسەردا جێبەجێ دەکات-.

(ابن تیمیة) -خوا لێی رازی بێ- لە بارەی گرنگیی و پێوی ستی هەبوونی حوکمڕان و کەسانێك، کە سەرپەرشتی ژیان و گوزەرانی خەڵك دەکەن، گوتوویەتی:

﴿يجب أن يعرف أن ولاية امر الناس من اعظم واجبات الدين، بل لا قيام للدين ولا للدنيا الا بها، فإن بني آدم لا تتم مصلحتهم الا بالاجتماع لحاجة بعضهم الى بعض، ولابد للاجتماع من رأس حتى قال النبي ﷺ: ((اذا خرج ثلاثة في السفر فليؤمروا أحدهم)) (رواه ابوداود عن أبي هريرة)، وروى الامام احمد عن عبدالله بن عمرو أن النبي ﷺ قال: ((لا يحل لثلاثٍ ان يكونوا بفلاةٍ من الارض الا أمروا عليهم احدهم)) فاوجب ﷺ تأمير الواحد في الاجتماع القليل العارض في السفر تنبيهاً بذلك على سائر انواع الاجتماع، ولأن الله تعالى أوجب الامر بالمعروف والنهي عن المنكر ولايتم ذلك الا بقوة وِامارة وكذلك سائر ما اوجبه من جهادٍ وعدل وأِقامة الحج والجُمع والأعياد ونصرة المظلوم واِقامة الحدود، ولهذا كان السلف كالفضيل بن عياض وأحمد بن حنبل و غيرهما يقولون:

(لوكانت لنا دعوة مجابة لدعونا بها للسلطان و ذلك لأن الله ي صلح بصلاحه خلقاً كثيراً)﴾ (السيا سة وال شرعية في ا صلاح الرا عي والرعية) مجموعة الفتاوى،ج□□).

واتە: پێویستە بزانرێ کە بەڕێوە بردنی کاروباری خەڵك لە فەرزە هەرە گەورەکانی ئایینە، بەڵکو دین و ژین بەبێ ئەوە نا چنە سەر، ئادەمیزادەکان بەهۆی پێوی ستیان بە یە کدی بەبێ کۆبوو نەوە بەرژەوەندیان مسۆگەرنابێ، دیارە هەر کۆمەڵەبوونێکیش سەرێکی هەر دەوێ، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکات سێ کەس بە سەفەرێك دەرچوون با یەکیان بکەنە فەرماندە، وە فەرموو یەتی: ڕەوانیە سێ کەس لەسەر زەمینێکی چۆڵیش بن یەکیان نەکە نە ئەمیریان.

جا پێغەمبەر ﷺ کردنە ئەمیری یەکێکی لە کۆبوونەوەیەکی کەم و زوو تێپەڕی سەفەردا پێویست کردوە تاکو بەوە ئاگادارمان بکا تەوە بۆ سەرجەم کۆبوونەوەو کۆمەڵبوونەکانی دی کەش، وە (دا نانی برا گەورە پێویستە) چونکە خوای بەرز فەرمان بە چاکەو ڕێگر یی لە خرا پەی پێویست کردوەو ئەویش بە بێ هێزو حوکمڕانیی نابێ، هەروەها تێ کڕای ئەو شتانەی دیکە کە پێویستی کردوون- بەبێ تواناو دە سەڵات ئەنجام نادرێن- وەك: جیهاد، دادگەریی، بەرپاکردنی حەج و نوێژەکانی جومعەو جەژنەکان و، یارمەتیدانی ستەم لێکراو و چەسپاندنی سزا شەرعییەکان، هەربۆیەش زانایانی پێشین وەك (فضيل بن عياض)و (احمد بن حنبل)و

غەیری وانیش گوتوویانە: ئەگەر زانیبامان دووعایەکی گیرامان هەیە بۆ حوکمڕانمان دەکرد، چونکە خوا بەهۆی ویەوە خەڵکێکی زۆر چاك دەکات.

خوێنەری بەڕێز!

بەم بڕە توێژینەوەیەش ئەو ڕاستییە زۆر جوان دەرکەوت کە: ( حوکم و سیاسەت) بەشێك و لایەنێکی گەورەو گرنگی ئایین و شەریعەتی کامڵ و گشتگیری خوایەو (شەریعەت و سیا سەت) دوو شتی تێک هەڵکێش و پێکەوە پەیوەست و گرێدراون و هەرگیز ناگونجێ لەیەك دابـڕێن.

هەروەها زۆر باشیش ڕوون بۆوە کە بەکارهێنانی و شەی (ئیـ سلامی سیاسی) بۆ پێناسەی تەوژمی ئیـ سلامیی و هەڵ سوڕاوانی مە یدانی کاروچالاکی ئیسلامیی هەر نیازو ئا مانجێکی لەپ شتەوە بێ، هە ڵەو بێجێیەو پێویستە وەك هەر قسەو تەعبیرێکی دی کەی هە ڵەو بێ جێ وازی لـێ بهێنرێ.

# بەشــی دووەم:

# وتـاری: سـیاسـەتی ئیسـلامیی و چـەند ڕوونکردنەوەیـەك

## ڕێ خۆشکردن

خوێنەری بەڕێز!

وەك لە پێشەكی ئەم نامیلكەیەشدا ئاماژەمان پێ كرد، ئەم بەشی دووەمە بریتیە لە دەقی ئەو وتارەی كە بەندە لە ئێوارەكۆڕێك لە شارۆچكەی (دەربەندیخان)و لەژێر ناوونیشانی: (سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونكردنەوەیەك)دا دراوە.

شایانی باسیشە كە ئەم وتارە بۆ چوار تەوەرەی سەرەكی دا بەش بووە كە ئەمانەن:

1- پێناسەی سیاسەت لە ئیسلام دا.
2- پێگەی حوكم و سیاسەت لە ئیسلام دا.
3- ئایا دەگونجێ حوكم و سیاسەت لە ئیسلام دابڕنرێ؟!
4- چەند بنەڕەتێكی گرنگی حوكم و سیاسەتی ئیسلامیی.

هەڵبەتە جۆرێك لەیەكچوونیش لەنێوان ئەم بەشەو هەندێك لە باس و بابەتەكانی بەشی یەكەمدا هەیە، بەڵام هەركامێكیشیان شتی جیاوازو سەربەخۆشی تێدایە و هەردووكیان تەواوكەری یەكدین و بڕای جیاوازی نێوان شێوازی نووسین و وتار.

ان الحمدلله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات اعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه.

بەرێزان، برایان خوشكان!

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

ئەم كۆڕەمان لەژێر ناونیشانی (سیاسەتی ئیسلامی و چەند ڕوونكردنەوەیەك)دا سازداوە، دیارە لە بەسەركردنەوەی بەندەدا بۆ دەڤەری گەرمیان، وە لە نێو دەڤەرەكەشدا بۆ شارۆچكەی(دەربەندیخان) و دانیشتووانی بەڕێزی، بە پێویستم زانی كە ئەم ئێوارەكۆڕە سازبكەین بۆ ئەوەی كە ئێوەی بەڕێز وەك بەشداربووانی ئەم كۆڕە ئاشنا بن بە دیدگاو بۆچوونی بەندە وەك بابایەكی ئیسلامیی، دەربارەی بابەتی:
(سیاسەت و حوكم لە ئیسلام دا)، كە ئێستا هەموولایەك ئاگادارین لە نێو كوردستان و عێراقیشدا وتووێژو باسوخواسی گەرم و گوڕ هەیە دەربارەی چەند بابەتێك، بە تایبەت بابەتی پەیوەندی ئیسلام بە بەڕێوەبردنی كۆمەڵگاو چۆنیەتی ئیدارەكردنی وڵات، وە ڕێژەو ئەندازەی بەشداری پێكردنی شەریعەتی ئیسلام لە دیاری كردنی چۆنیەتی

بەڕێوەبردنی ولاّت و کۆ مەڵگای ع یـراقدا بە گ شتی و کۆ مەڵگای کوردەواریمان لە کوردستاندا بە تایبەت.

چا بێگو مان ئی سلامیش کە بەرنا مە(دین)ی کۆ تایی خوای پەروەردگارە بۆ بەشەر، وە ئێمەش وەك خەڵکی مسوڵمانی کوردستان کە بەشێکین لە ئوممەتی پێغمە بەر ﷺ و ولاّتە کەشمان کە کورد ستانی خۆشەویستە بە پارچەیەك لە نیشتمانی ئی سلامیی دەزا نین، شتێکی پێویستە لەسەر هەموو لایەکمان کە بزانین دینەکەمان، دی نی خەڵ کە مسوڵمانەکەمان چۆن تەماشای بابەتی حوکم و سیاسەت دەکات، وە چۆن تەماشای قەوارە (کیان)ی سیاسی دەکات، چونکە ئەوەی کە تێبی نی دەکرێ لە دامودەزگا و کەناڵەکانی راگەیا ندن بە بی نراو بی ستراو و خوێندراوەوە، ئەوەیە کە: بێ ئاگاییەکی زۆر هە یە لە لا یەن زۆر بەی ئەوانەوە کە دەربارەی ئیسلام و سیاسەت لە ئیسلامدا و قەوارەی سیاسی لە ئیسلام دا دەدوێن(16).

لەبەر ئەوەش من ناونیشانی وتارەکەم بەم شێوەیە دا نا: (سیا سەتی ئی سلامیی) چونکە ئێ ستاکە زاراوە یەك بۆ تەوژمی ئی سلامیی بەکاردەهێنرێت جا چ لە کوردستان دا و چ لە غەیری کوردستان دا کە ئەو زاراوەیە هەڵەیە ئەویش بریتیە لە (ئی سلامی سیا سیی) کە لە

(16) چونکە بەدا خەوە حیز بە عەلمانی یە دە سەڵاتدار و پارەدارە کان کەنا ڵەکانی راگەیاندنیان تەنیا لەسەر خەڵکی وابەستە بەخۆیان تەرخان کردوە بەدەگمەن نەبێ ڕێ بە ڕاو دەنگ و ڕەنگی جیاواز نادەن، هەرچەندە زۆریش بانگەشە بۆ(پلۆڕالیزم- التعددیه) دەکەن و پێیدا هەڵدەڵێن!

ڕاستیدا ئەم زاراوەیە هەڵەیە، چونکە ئەگەر گوتمان (ئیسلامی سیاسیی) دیارە دەبێ (ئیسلامی نا سیاسیی)یش هەبێت، هەروەك کاتێك دەگوترێ (ئیسلامی جیهادیی)دەبێ، (ئیسلامی نا جیهادیی)یش هەبێت، جا وەك گوتم ئەو زاراوەیە هەڵەیە و ڕاست ئەوە یە کە ب گوترێ: (سیا سەتی ئیسلامیی) وەك دە گوترێ: (جیهادی ئیسلامیی) یان (عەقیدەی ئیسلامیی)، (عیبادەتی ئیسلامیی)،ئەخلاقی ئیسلامیی)، (ئابووری ئیسلامیی)...هتد.

چونکە هەرکام لە سیا سەت و ئابووریی و لایەنەکانی عەقیدە و عیبادەت و ئەخلاق و ئەوانە هەرکامێکیان بەشێکن لە پێکهێنەرەکانی ئیسلام، ئیسلام وەك بەرنامەی هەمەلایەنەو سەرتاپای ژیان.

جا من وتارەکەم لە چوار تەوەری سەرەکیدا پێشکەشی ئێوەی بەڕێز دەکەم، سەرەتا پێناسەی سیاسەت دە کەین، دوایی پێگەی حوکم و سیاسەت لە ئیسلامدا دیاری دەکەین، پا شان تیشك دەخەینە سەر مەسەلەی: ئایا دەگونجێ حوکم و سیاسەت لە ئیسلام دابڕنرێ؟!

وە لە تەوەرەی چوارەمیشدا باسی هەندێك لە پایە بنەڕەتی یەکانی حوکم و سیاسەت لە ئیسلام دا دەکەین.

## تەوەرەی یەکــەم:

# پێنـاسـەی سـیاسـەت لە ئیسـلام دا

بەکورتی دەتوانین بەم شێوەیە پێناسەی سیاسەت بکەین: جارێ وشەی سیاسەت لە ئەسڵ دا وشەیەکی عەرەبییە، ڕیشی تێدەچێ لە ئە سڵ دا لە زمانێکی غەیرە عەرەبییەوە هاتبێ، بەڵام ئەو و شەیە لە ز مانی عەرەبیدا زیاتر بەکاردێ، جا لە فەرهەنگەکانی(17) زماندا دەڵێ: (ساسَ الامر یسوسه سیاسةً اي: دَبَّره) یانی: کە دەگوترێ: سیاسەتی ئەو کارەی کرد، واتە: بەڕێوەی بردو سەرپەرشتی کرد، وشەی (السیاسة) لە ڕیشەدا لە (سَوس)ەوە هاتوە کە بە مانای سەرۆکایەتی (الریاسة) دێ، دەگوترێ: (ساسوهم سَوْساً، وساس الامر سیاسةً: قام به) وا تە: سەرپەر شتییان کردن، وە بەکارەکە هەڵستا، وە دەگوترێ: (سوِّس فُلان أمرَ بني فلان أي كُلِّف سیاستهم) واتە: فلانکەس سیاسەتی فلانە تیرەیەی پێ سپێرراوەو سەرپەرشتی کردنیانی عاید کراوە، پا شان وەك زاراوە یەکی هاو چەرخ وشەی (سیاسی) تایبەت کراوە، بەکەسێك کە سەرپەرشتی خەڵك وگەل و

(17) بڕوانە: (اساس البلاغة)ی (الزمخشری)،ص313، وە(لسان العرب)ی (ابن منظور)ج6، ص430-450، وە (ا بن منـ ظور) لە پێنا سەی و شەی سیا سەت دا گوتوو یەتی: (والسیاسة القیام علی الشيْ بما یصلحه فالوالي یسوس الرعیة ویسوس أمرهم...). واتە: وە سیاسەت بریتیە لە هەڵسان بەکارێك و سەرپەرشتی کرد نی بە شێوەیەك کە چاکی بـ کات و ڕێ کی بخات جا (وا لي) سەپەر شتی خەڵك دە کات و کاروبار یان هەڵدەسووڕێنێ..).

وڵات دەكات و مشوور دەخوات لە بەڕێوەبردنی كاروباری وڵات، ئەگەر نا لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا ماناكەی فراوانتر بووە، واتە: هەركەسێك سەپەرشتی هەر كارێكی كردبێ پێی گوتراوە سیاسی، وە بەكارەكەشی گوتراوە سیاسەت(18).

كەواتە وشەی سیاسەت چەمك و واتاكەی وەك ئێستا باوە بە كورتی واتە: سەرپەرشتی كردن و مشوور لێخوادن و بەڕێوەبردن، جا وەك گوتیشم ئەوە تایبەت كراوە بە سەرپەرشتیكردنی كاروباری وڵات و كۆمەڵگاو خەڵك، دیارە وشەی سیاسەت لە قورئاندا نەهاتوە بەڵام هەر كام لە وشەكانی (حكم، شريعه، أمر، دين) لە قورئاندا هاتوون كە ئەوانیش مەفهووم و واتاكەیان لە وشەی سیاسەتەوە نزیكە، بەڵام وشەی سیاسەت لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە كە فەرموویەتی: ((كانت بنو اسرائيل تسوسهم الانبياء كلما هلك نبي خلفه نبي وانه لا نبي بعدي وسيكون خلفاء فَيكْثُرُون) -رواه البخاري ومسلم-، واتە: بەنی ئیسرائیل پێغەمبەرانیان عليهم الصلاة والسلام سەرپەرشتی كاروبارو حاڵو باڵیان دەكردن (تسوسهم الانبياء) واتە: پێغەمبەران سیاسەتی ئەوانیان دەكرد، سەرپەرشتیان دەكردن و كاروباریان بۆ هەڵدەسووڕاندن، دواتر دەفەرموێ: هەر كاتێك پێغەمبەرێك وەفاتی دەكرد پێغەمبەرێكی دیكە شوێنی دەگرتەوە، بەڵام دوای من هیچ پێغەمبەرێكی دیكە نایەت كە بەسیاسەتێكی تایبەتی پێغەمبەرانەو

---

(18) هەر بۆیەش لەزمانی عەرەبیدا بەو كەسەیان گوتوە كە خزمەتی ئەسپی كردوەو ڕای هێناوە ومەشقی پێ كردوە: (سائس الفرس).

(رباني)یانە سەرپەرشتی کاروباری خەڵك بکات بەڵکو مـن جێنـ شینـم دەبن و ئەوانیش زۆر دەبن، واتە: لە جێگای پێغەمبەرﷺ چەند جێنشین (خلیفة)ێك دەبن کە سەرپەرشتی کاروباری خەڵك دە کەن بەپێی ئەو شەریعەت و بەرنامە خوایی یە کە بۆ پێغەمـبەری کۆتایی محمد ﷺ هاتوە. ئەوە بە کورتی چەمك و واتای وشەی سیاسەت کە لەوەدا پوخـتە بۆتەوە: سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردن و مشوورخواردنی کاروبارو ژیان و گوزەرانی خەڵك.

جا ئەگەر ئەو سەرپەر شتیکردن و بەڕێوەبردنە لە(وحی) خواوە سەر چاوە بگرێ ئەوە پێی دە گوترێ سیا سەتێکی شەرعییانەو سیاسەتێکی خوایی و ئیسلامیی، بەڵام ئەگەر لە غەیری وەحی یەوە سەرچاوە بگرێ[19]، ئەوە دیارە بە پێی ئەو سەرچاوەیە کە لێیەوە هاتوە نازناوی خۆی وەردەگرێت، دیارە بە سەرنجدانی پێنا سەی زانایانی هاوچەرخیشمان بۆ سیاسەتی شەرعی ئەو ڕاستیە چاکتـر ڕوون دەبێتەوە:

1- (عبدالوهاب خـــلاف) لەوبارەوە گوتوویەتی[20]:

(فالسياسة الشرعية هي: تدبير الشؤن العامة للدولة الاسلامية بما يكفل تحقيق المصالح ودفع المضار ... ويقصدُ بالشؤن العامة: كل ما

---

(19) واتە وەك بناغەکەی و هێڵە گشتی و سەرەکیی یەکانی، ئەگەرنا لە شەریعەتی وردبینانەو دووربینانەی خوای کاربەجێ و زاناو شارەزادا دەرفەت و بوارێکی زۆر هێڵراوەتەوە بۆ عەقڵی مرۆڤ ـ، کە بەگوێرەی گۆڕان و بەرەو پێش چوون و پەرەستاندنی ژیان و گوزەرانی و پێداویستیەکانی لەبەر تیشکی شەریعەت دا کۆشش (اجتهاد) بکات و ئەو بۆشاییە بەجێهێڵدراوانە پڕ بکاتەوە .

(20) بڕوانە: (السياسة الشرعية) ص16،15.

تطلبه حياتهم من نظم سواء أكانت دستورية أم تشريعية أو قضائية أم تنفيذية وسواء أكانت من شؤنها الداخلية أم علاقاتها الخارجية).

واته: سیاسەتی شەرعی بریتیە لە بەڕێوەبردنی کارو باری گ شتی دەولەتی ئیسلامی بەجۆرێك کە بەرژەوەندی یەکان دابین و زیانەکان وە دوور بخات... مەبە ستیش لەکاروباری گ شتی سەرجەم ئەو سیستەمانەیە کە ژیان و گوزەرانیان دەیانخوازێ، جا ئایا پەیوە ندییان بەدەستوورەوە هەبێ، یان یاسا دانان یان دادوەرییان جێ بەجێکردن، وە یەکسانە کە پەیوەست بن بەکاروباری نێو خۆوە یان پەیوە ندی یە دەرەکییەکانەوە.

2- (عبدالرحمن تاج)یش لەو بارەوە گوتو یەتی [21]: ( أ ما السيا سة الشرعية فهي الاحكام التي تُنظم بها مرافق الدولة وتدَّبر بها شؤن الامة مع مراعاة أن تكون متفقة مع روح ال شريعة ناز لة ع لى أصولها الكلية فَحَقِّقةً لأغراضها الاجتماعية ولو لم يدل عليها شيٌ من النصوص التفصيلية الجزئية الواردة في الكتاب والسنة)

واته: سیاسەتی شەرعیی ئەو یا سایانەن کە دامودەزگا کانی دەولەتیان پێ ڕێك دەخرێن و کاروباری ئومەتیان پێ بەڕێوە دە برێ لەگەلْ ڕەچاوکردنی گونجاوییان لەگەلْ ڕووحی شەریعەت و بنە چینە سەرەکییەکانیداو دا بین کردن یان بۆ ئاما نجە کۆمەلآیەت یەکانی

(21) بڕوانە: (خ صائص التـ شريع الا سلامي) ص190، کە هی(فتحي ا لدريني) یەو ئەو قسەیەی لە (عبدالرحمن تاج )ەوە هێناوە.

هەرچەندە هیچ دەقێکی تایبەتی و سەربەخۆیان لە قورئان و سوننەتدا لەسەر نەبێ .

3- (فتحي الدرينـــي) یش گوتوویەتی[22]:

( فالسياسة الشرعية انما تعني : تعهد الأمر بما يصلحه).

واتە: سیاسەتی شەرعیی بریتیە لە سەرپەرشتیکردنی کاروباری دەوڵەت بە شێوەیەك كە ببێتە مایەی چاك بوونی.



(22) بڕوانە: (خصائص التشريع الاسلامي) ص193، فتح الدريني، وەبڕوانە: (الجريمة السياسية في الشريعة الاسلامية والقانون) د.منذر عرفات زيتون،ص16،15.

## تەوەرەی دووەم:

# پێگەی حوكم و سیاسەت لە ئیسلام دا

ئەوجار بابزانین ئایا:

حوكمڕانیی و سیاسەتكردن، بەڕێوەبردن و سەرپەرشتیكردنی وڵات و كۆمەڵگا لە ئیسلامدا چ پێگەیەكی هەیەو (محلّ)ی لە (إعراب)ی ئیسلامدا چیە؟!

لە راستیدا بۆ ئەوەی بزانین حوكم و سیاسەت، وە هەبوونی قەوارەی سیاسی، وە سەرپەرشتیكردنی كاروباری كۆمەڵگا بەپێی شەریعەتی خوا، وە پەیوەندی نێوان سەرۆكی وڵات و خەڵك و كۆمەڵگا، وە ماف و پێویستی سەرشانی هەركامێكیان لە بەرانبەر یەكتردا چیەو چۆنە؟! پێویستە سەرنجێكی خێرا لە تێڕوانینی ئیسلامی بدەین بۆ ژیان و ئینسان و، بۆ چۆنیەتی پەیوەندی نێوان ئینسان و خوای پەروەردگار، وە تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژیانی دنیاو دوارۆژو بۆ حیكمەتی خوڵقێنرانی ئینسان، چونكە ئەوانە هەموویان بەیەكەوە پەیوەست و گرێدراون، وا تە سیاسەتی ئیسلامیی تێكهەڵكێشەو پەیوەستە بە عەقیدەی ئیسلامییەوە، وە بەجیهانبینی و تێڕوانین(تصور)ی ئیسلامییەوە، وە بە عیبادەت و ئەخلاقی ئیسلامییەوە، هەموو ئەو مەسەلانە تێكهەڵكێشن.

خوای تاك و پاك (عزّوجل) دەربارەی حیکمەت و هۆی دروستکرانی بوونەوەر و دروستکرانی ئینسان و هەڵخرانی ژیان دە فەرمویّ: ﴿وَ هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاء لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِن بَعْدِ الْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ (7-هود)، لێرەدا خوای کاربەجێ خۆی ئاوا پێناسە دەکات و دەفەرمویّ: خوا(جل شأنە) ئەو بەدیهێنەرەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش(6) رۆژ[23](قۆناغ)دا دروستکردوون وە بارەگا(عرش)ی خوا (سبحانەوتعالی) لەسەر (ئاو)[24] بوو، ئنجا خوای بێ هاوەڵ، حیکمەت و فەلسەفەی دروستکرانی ئەم بوونەوەرەو دروستکرانی ئینسان لە نێویدا دەخاتەڕوو و دەفەرمویّ: ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾ بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی چاکترە. لەم ئایەتەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە دروستکرانی ئەم بوونەوەرە هەمووی بە بینراو و نەبینراوییەوە، وە ئینسانیش بە تایبەت لە نێویدا بۆ ئەوەیە کە ئینسان تاقی بکرێتەوە.

(23) چونکە (یوم) لە زمانی عەرەبی دا کە کۆیەکەی (ایام)ە واتە: ماوەیەکی زەمەنی، مەرج نیە (24) سەعات یان (12) سەعات بێت، بەڵکو واتە قۆناغێك لە کات.

(24) واتە: بەرلەوەی ئەم بوونەوەرە ئەم دیمەنەی ئێستای وەربگرێ بارەگا (عرش)ی خوای بێ وێنە لەسەر (ئاو) بوو،کە هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ بارەگاکەی چۆنەو ئەو ئاوەش چۆن بووە! شایانی باسیشە کە چەمك و واتای وشەی بوونەوەر (کون) تەسکترە لە هی ئاسمانەکان و زەوی.

کەواتە ئەم بوون (وجود)ە هەمووی شانۆیەکە کە ئینسانی تێدا تاقی دەکرێتەوەو ئەم بوونەوەرە هەمووی پەیوەندی هەیە بە ئینسان و ژیانی ئینسانەوە، جا بێگومان لەوەش دا دەردەکەوێ کە ئینسان دروستکراو (کائن)ێکی زۆر گەورە و ناوازەیە، وەك شاعیرێك دەڵێ:

(لقد خلقت لامر عظيم لو فطنت له

فآربأ بنفسك أن ترعى مع الهمل)

واتە: تۆ بۆ کارێکی زۆر گەورە دروستکراوی ئەی ئینسان ئەگەر عەقلت پێی بشکێ، دەجا لە خۆتی مەوە شێنەوە کە لە گەڵ ئاژەڵدا بلەوەڕێی، واتە: ژیانێکی ئاژەڵانە مەبەسەر چونکە تۆ ئاژەڵ نی تۆ ئینسانی، خوای پەروەردگاریش ئەم بوونەوەرەی هەموو بۆ ئەوە دروست کردوەو ڕەخساندوە تاکو ئینسانی تێدا تاقی بکرێتەوە.

لە شوێنێکی دیکەدا خوای بەرزو مەزن باسی ژیان و مەرگ دەکات و ژیانی دنیاو کۆتایی ژیانی دنیاش هەمووی دەبەستێتەوە بە ئینسانەوەو بە تاقیکردنەوەی ئینسانەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ..﴾ (الملك-2) ، دیسان خوای پەوەردگار پێناسەی خۆی دەکات و دەفەرموێ: ئەو خوایەی کە مردن و ژیانی ڕەخساندون تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی چاکترە .

وە لە سوورەتی (الاحزاب)دا گۆشەیەکی دیکە لە تیڕوانینی ئیسلامیی بۆ بوونەوەرو ژیان و ئینسان، دەخاتە ڕوو کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ

مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ (الأحزاب-72)، ئەم ئایەتە توێژەرەوانی قورئان زۆر هەڵوەستەیان لەبەردەمدا کردوە، دە فەرموێ: ئێمە ئەمانەتمان ڕانواند، ڕاسپاردەی خۆمانمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان، بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون هەڵیگرن و لێی ترسان -واتە: ئامادە نەبوون ئەو ئەمانەتەی ئێمە بخەنە سەر شانی خۆیان وە لێی ترسان- بەڵام ئینسان ئەو ئەمانەتەی ئێمەی هەڵگرت بێگومان ئینسان زۆر ستەمکارو نەفامە.

واتە: ئینسان ئەگەر بە پێی بەرنامەی خوا بەڕێوەنەچێ، سەری لە زوڵمو ستەم ونەفامییەوە دەردەچێ، بەڵام کاتێك کە پابەندبێ بە بەرنامەی خواوە، خراپەو زوڵمەکەی دەگۆڕێ بۆ چاکەو داد، وە نەزانیی و نەفامییەکەیشی دەگۆڕێ بۆ زانیاری و زانست، چونکە بەرنامەی خوا بەرچاوی ئینسان ڕۆشن دەکاتەوە بە ڕووناکی (وحي)و زانیاری پێدەدات دەربارەی خۆی، دەربارەی ژیانی، دەربارەی بوونەوەر، دەربارەی ڕابردووی، دەربارەی داهاتووی، وە دەربارەی ئەرکی لەم ژیانەدا، وە هەروەها چۆنیەتی پەیوەندی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، وە سەرئەنجام و پاشەڕۆژی.

وە بەرنامەی خوا وا لە ئینسان دەکات  بە تاك و کۆمەڵەوە- کە تووشی زوڵم و ستەم و لادان و ئەملاولا نەبێ، بەڵکو ڕاستە شەقامی خوا بگرێت، کەواتە ئینسان و ژیانی ئینسان بۆ ئەوەیە، کە مرۆڤ لەم ژیانی دنیایەدا ئەمانەت و ڕاسپاردەی خوا هەڵبگرێ، وە زۆربەی زانایان ئەم ئەمانەتەشیان بەوە لێکداوەتەوە، کە بریتیە لە ژیانێکی ئازادانە بە پێی

ئیرادەو ویستی خۆی، واتە: ئینسان بەشێوەیەك بژی کە بە پێی ئیرادەی ئازادی خۆی بەڕێوە بچێت، ئیدی بەرەو کام لا دەچێت با بچێ و دوایی خۆی لە هەڵبژاردن و کردەوەی خۆی بەرپرسیارە.

کەواتە: مەبەست لەو ئایەتە بەپێزە ئەوەیە کە:

نە ئاسمانەکان و نە زەوی و نە شاخ و چیاکان ئەوەیان لە توانادا نەبووە، یاخود ئەگەر عەقڵ و ئیرادەیان ببوایە ئامادە نەدەبوون، کە بەویستی خۆیان بژین و بەڕێوەبچن، بۆیە ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان و هەموو ئەو بوون(وجود)ە کە ئێمە، دەیبینین و ئەوەشی کە نایبینین خوای کاربەجێ ملی پێ کەچ کردوە بۆ کۆمەڵێك دەستوورو یاسای خۆی، کە لە ئیرادەی خۆی بەدەرن، بەڵام ئینسان لە نێو هەموو بوون دا ریز پەڕەو بە ویست و ئیرادەی ئازادانەی خۆی دەژی، وەك خوای بەدیهێنەر دە فەرموێ: ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ (الإنسان-3)، واتە: ئێمە ڕێمان پیشان داوە، جا دەتوانێ سوپاسگوزار بێ (بۆ خواو خاوەنی خۆی) دەشتوانێ سپڵەو ناسوپاس بێت.

واتە: خوای بەدیهێنەر بە شەرعی خۆی و لە ڕێگەی (وحي)ی خۆیەوە لەسەری پێویست کردوە، کە سوپا سگوزار بێ، بەڵام زۆر (جبر)ی لێنەکردوە، کە حەتمەن ڕێگەی هیدایەت و سوپاسگوزاریی خوا بگرێت، بەڵکو ئازادی کردوەو سەرپشکی کردوە، دواییش لە دوارۆژدا شایستەی پاداشت یاخود سزا دەبێ لەسەر بەرهەم و ئەنجامی ئەو ویست و ئیرادە ئازادانەیەی، کە پێی دراوە.

لە سوورەتی (البقرة)شدا خوای پەروەردگار باسی بە سەرهاتی بابی مرۆڤایەتی (آدم) (علیه الصلاة والسلام)مان بۆ دە کات و دە فەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً...﴾ (البقرة-30).

واتە: کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو من جێنشین (خلیفە)یك لەسەر زەوی دادەنێم.

کە زۆربەی توێژەرەوان (مفسرین)ی قورئان دەڵێن: لێرەدا جێنشین واتە جێنشیی خوای پەروەدگار، دیارە ئەوەش بریتی نیە لەوەی کە بگوترێ: ئینسان لە شوێنی خوا دادەنیشێ بە مانایەکی روا لەتی، بەڵکو بەو مانایەیە کە خوای پەروەردگار ئازادی و توانای هەڵسوکەوت و جمو جۆڵ (تصرف) کردنی لەسەر زەوی بە مرۆڤ داوەو بەڕێوەبردنی سەرزەوی بە ئینسان سپاردوە، جا ئەوەش شتێکی ئاشکراو بەڵگەنەویستەو دەبینین ئینسانەکان بە کافرو مسوڵمانەوە، جێنشینی خوان بەو واتایە کە خوای پەروەردگار دەستی ئینسانی کردۆتەوەو ئازادی کردوە لە ژیانی سەر زەویدا، بەڵام ئاگاداریشی کردۆتەوە کە راست بڕواو چەوت نەڕوا، وە لە ڕێی پێغەمبەرانی خۆشەویستەوە (علیهم الصلاة والسلام) پەیام و بەرنامەی خۆی بۆ ناردوە کە ڕێنمایی دەکات، بەرەو ڕێبازێك کە ڕەزامەندیی خوای تێدایەو بەختەوەری دنیاو دوارۆژی خۆشی تێدایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئینسان لەسەر زەوی ئازادەو خوای پەروەردگارو پەنهانبین سەرپشکی کردوە کە چۆنی پێخۆشە بەو شێوەیە بژی! وەك گوتمان لە ڕێگەی پێغەمبەرانیشەوە (علیهم الصلاة والسلام) کە مژدەدەرو ترسێنەر

(مبشرین ومنذرین)ن ئاگاداری کردۆتەوە کە ئەگەر راستەوخۆ بڕواو بەو شێوەیە ژیان بەرێتە سەر کە جێگەی رەزامەندیی خوایە، ئەوە پاداشتی رەزامەندی خواو بەهەشتەو، ئەگەر لاریش بڕوا توو شی تووڕەیی خواو سزای دۆزەخ دەبێت، وەك فەرموویەتی: ﴿رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ (النساء-165)

واتە: پێغەمبەرانێکی مژدەدەرو ترسێنەرن تاکو پاش هاتنی پێغەمبەران خەڵکی بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ، وە خوا زاڵ و کاربەجێ بووە. لە سوورەتی (الذاریات)یشدا خوای کاربەجێ ئەرکی ئینسان لە بەندایەتیکردنیدا بۆ خوا کورت هەڵدێنێت، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاریات-56).

واتە: جیــن و ئادەمیزادم تەنیا بۆ ئەوە دروستکردون کە بەندایەتیم بۆ بکەن و بمپەرستن. جا بەندایەتیکردن و پەرستنی ئینسان بۆ خوا بریتییە لە هەڵگرتنی ئەمانەت و راسپاردەکەی و بریتییە لە جێبەجێکردنی شیناییەتی کردنی خوای پەروەردگار بەپێی رەزامەندیی خواو بە پێی شەریعەت و بەرنامەکەی، وە بریتیە لەوەی کە کردەوەی چاك ئەنجام بدات، چاکیی کردەوەش بەوە دەبێ کە بە پێی شەرعی خوا بێ و بە مەبەستی بەندایەتی کردن بۆ خواو رازی کردنیشی بێت.

کەواتە: ئەم ئایەتانە هەموویان قسە لەسەر یەك بابەت دەکەن، ئەویش ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئینسانم بۆیە دروستکردوە تاکو تاقی بکەمەوە، تاقیکردنەوەکەش لەوەدا خۆی

دەبینێتەوە کە بەرنامەو ڕێبازی خوا بگرێ و گرتنی ڕێبازو بەرنامەی خواش لە لایەن ئینسانەوە ئەوەیە کە بەندایەتی بۆ خوا بکات، بەندایەتی کردنیش بۆ خوا ئەوەیە کە سەر زەوی ئاوەدان دەکاتەوە بە پێی بەرنامەی خوا، وە ژیانێك دەگوزەرێنێ کە خوای بەدیهێنەر بۆ ئینسان هەڵی بژاردوە کە بریتیە لە ژیانێکی ئینسانانە، ژیانێك کە ڕێزو پایەو حورمەتی ئینسانی تێدا دەپارێزرێ لە دنیاو لە دوارۆژدا.

کەواتە دەتوانین بڵێین: پێگەی حوکم و سیاسەت لە بەرنامەی ئیسلامدا ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دوای ئەوەی ئینسانی لەسەر زەوی داناوە تاقی بکاتەوە، وە دوای ئەوەی ئیسانی کردوە بە جێنشینی خۆی، وە دوای ئەوەی ئەمانەتی خۆی خستۆتە سەرشانی ئینسان، ئینسانی وێڵ نەکردوە! بەڵکو بە پێغەمبەرانی خۆیدا (علیهم الصلاة والسلام) فەرمایشت (وحي)ی خۆی بۆ ناردوەو لەو ڕێیەوە ئینسانی دواندوەو قسەی لەگەڵدا کردوە تاکو لە ئینسان بگەیەنێت کە ئەی ئینسان! من خاوەنی تۆم و تۆ بۆ ئەو مەبەستە خولقاوی، وە تۆ لە فلاَن شوێنەوە هاتووی، وە ئەرکت لە ژیانی دنیا بەو شێوەیەیە، وە دەبێ بەو شێوەیە بژی، وە ئەوەش سەرەنجام و پاشەڕۆژتە!

کەواتە: سیاسەت لە ئیسلامدا واتە چۆنیەتی سەرپەرشتیکردنی ژیانو گوزەرانی خەڵك بەو شێوەیەی کە لە لای خوا پەسندەو بەو شێوەیەی کە خوای پەوەردگار بە پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) ناردوویەتی و دیاری کردوە.

## تەوەرەی سێیەم:

## ئایا دەگونجێ حوکم و سیاسەت لە ئیسلام دابڕنرێ؟!!

هەڵبەتە ئێستا لەم ڕۆژانەدا لە لایەن تەوژمی عەلمانییەوە زۆر باس لەوە دەکرێ کە دەبێ حوکم و سیاسەت لە دین جیابکرێتەوە، وە دەبێ دین و دەوڵەت جیابن و ئەو بابەتە قسەی زۆری لەسەر دەکرێ، بەڵام مەخابن کە ئەو قسەو باسانە کەمتر وایە هی خەڵکی شارەزاو پسپۆر بن لە ئیسلامدا، بەڵکو زیاتر هی کەسانێکن کە بە ئیسلام نە شارەزاو نائاشنان، وە ئەو قسەو باسانە کە دەکرێن زیاتر دووپاتکردنەوەی قسەی خەڵکی ڕۆژئاوایە بە ئەمریکاشەوە، چونکە کاتی خۆی لەوێ کێشمەکێش و ناکۆکییەکی زۆر لە نێوان کڵێساو خەڵك و جەماوەردا بەرپابوو، بە تایبەت خەڵکی شارەزاو فەیلەسووف و بیریار ئەوانە کە بیریان لەوە دەکردەوە کێشەو گرفتەکانی خەڵك چارەسەر بکەن، وە خەڵك و جەماوەر لەو نەهامەتییەی لەسەریان فەرزکرابوو و لەو کابووسەی کە هاتبوە سەر سینگیان، قوتاریان بکەن و دەربازیان بکەن، بەڵێ ململانێ(صراع)یکی زۆر لە نێوانی کڵێساو پادشاو دەرەبەگ لە لایەك، وە خەڵك و جەماوەر بە قیادەی زانایان و بیریاران و سیاسەتمەداران لە لایەکی دیکەوە بەرپابوو، وە سەرئەنجام کۆتایی بەوەهات کە کڵێساو پیاوانی کڵێساو هاوپەیمانەکانیان شکستیان خوارد، ئەوەبوو کە یەکێك لە دروشمەکانی

شۆرشی فەرەنسا کە لە ساڵی (1789) بەرپاکرا، وە وەرچەرخانێکی لە مێژووی ئەورووپاو وڵاتانی رۆژئاوادا بە گشتی درو ستکرد، یەکێك لە دروشمەکانیان ئەوەبوو دەیانگووت: دوایین پادشا بە رِیخۆ لەی دوا یین قەشە ئیعدام بکەن! چونکە خەڵك لەویٚ گیر یان خوارد بوو بەدە ست سێکوچکەیەکی شوومەوە، سێکوچکەی: (پادشا، پاپا، دەرەبەگ) کە لە راستیدا ئەوانە هەرسێکیان یەکدەنگی یەکی ناموقەددەسیان لە نێواندا هەبوو لەسەر دابەشکردنی دە سکەوتەکان و چۆنیەتی چەو ساندنەوەی خەڵك و کۆمەڵە ئیمتیازێکی زۆریان بۆ خۆیان قۆرخ کرد بوو لە سەر حیسابی خەڵك و جەماوەر، وە کڵێسا کە ئەوکاتە خۆی بە نوێنەری دینی شێوێنراوی مەسیحی دەزانی کە بێگومان دی نی مە سیح وا تە دی نی عیسا(علیەالسلام) شەریعەتێك بوو لەو شەریعەتانەی کە خوای بەبەزەیی ناردبوونی بۆ رێکخستنی ژیانی ئین سان، بەڵام دوا یی ئەو شەریعەت و دینە دەستکاریی کراو گۆڕدرا، وە پڕکرا لە ئەفسانە و شتی خراپ کە لەگەڵ هیچ عەقڵ و (منطق)ێکدا نەدەگونجا، جا ئەو ئایی نە شێوێنراوە کرابوو بە کۆسپ و لەمـ پەر و ئا ستەنگ لە بەردەم ژ یانی خەڵکدا بەشێوەیەك کە لەگەڵ ئەفسانەو نەفامیی (جهل) دا بوو و دژی زانیاری و زانست (العلم والمعرفە) بوو، وە لەگەڵ زوڵم و ستەم دا بوو و دژی دادگەریی بوو، وە لەگەڵ دەسەڵاتدارەکان بوو و دژی بێ دە سەڵات و چەوساوەکان بوو.

بۆیە خەڵك و جەماوەر لەو دامودەزگای کلێ ساو پاد شا و دەرە بەگ راپەڕین، تا سەرئەنجام چەند شۆرشێکی بەردەوام و چەند کودەتا یەك سەریان گرت و لە ئاکامدا ئەو (دین)ە لە ژیانی خەڵك دوور خرا یەوە، بەڵام وەك گوتمان دینێکی دەستکاریی کراوی پڕ لە ئەف سانە نەك ئەو دینە تێروتەواو و بێ کەموکوڕییەی کە ئێستا ئێمە لە نێومان دایە، کە تاکە دینی راست و دروست و پارێزراو و بێ هەڵەی خوایە، کە ئیسلامە بۆیە خەڵکی ئەوروپا ناچاربوون ئەو دینە شێوێنراو و پڕ لە ئەفسانەیەی نەصرانی لە ژیانی خۆیان دووربخەنەوە، وە بێگومان ئەوان شتێکی باشیان کرد، چونکە لە راستیدا ئەگەر وایان نەکردبایە ئێستاش ئەوروپا هەر لە تاریکییەکانی سەدەکانی نێوەڕاستدا دەمایەوە کە بە سەدەکانی تاریکی ناو دەبرێن[25] بەڵام بێگومان تەنیا بۆ ئەوروپاییەکان ئەو قسەیە راستەو ئەوساکە لە تاریکاییدا بوون، تاریکی زوڵم و ستەم و بێدادی، تاریکی ئەفسانەو نەزانی و نەفامیی، تاریکی شەڕی مەزهەبی کە خوێنێکی زۆر لە نێوان(کاثولیك و پرۆتستانت)دا رژاو چەندان ملیۆن کەسیان لە یەکتر کوشت، جا ئەگەر ئەوروپا ئەو دینە تێکدراوەی خۆیان پاڵ پێوە نەنابا یە ئێستاش هەر لە سەدەکانی نێوەڕاست و تاریکاییەکانیدا دەمانەوە.

کەواتە وەك باسمان کرد را پەرینی خەڵکی ئەوروپاو رۆژ ئاوا بە ئەمریکاشەوە لەو دینە شێوێنراو و پڕ لە ئەف سانەیەی خۆ یان، لە دامودەزگای کلێسا کە بە ناحەق وەکالەتی خوایان دەکرد لە سەر زەوی و

---

(25) کە مەبە ست پێ یان ئەو دە سەدەیەن کە دەکەو نە ن یوان سەدەی (5–17)ی زایینییەوە، واتە سەدەی (6 16)

دەیانگوت: ئێمە سێبەری خواین لە سەر زەوی، بەڵێ رۆژئاوایییەکان هەرچۆن بێ پاساوێکیان بەدەستەوە هەبوو بۆ راپەرین دژی دینی تێکدراوی مەسیحی، ئەگەرنا بێگومان ئەگەر هاتباو دینی راستی خوایان لەبەردەست دابووایە کە ئیسلامە ئەو راپەڕینەیان شتێکی بێجێ دەبوو.

بەڵام بێگومان ئەو حاڵەتە لە نێو ئێمەداو لە جیهانی ئیسلامییدا پێگەی نیە، هەر بۆیەش تەماشا دەکەین سیکۆلاریزم هەموو بیردۆزەکانی دیکەی وەك: مارکسیزم، کاپیتالیزم، لیبرازیم، سۆسسیالیزم و هەموو ئەو بیردۆزانە کە پەیوەندیی یان بە فیکرو سیاسەت و بەڕێوەبردنەوە هەیەو باسی چۆنیەتی ڕێکخستنی ژیانی خەڵك دەکەن، توانیویانە تا ئەندازەیەك جێ پێی خۆیان لەوێ بکەنەوە، بەڵام لەنێو ئێمەی مسوڵمان و لە جیهانی ئیسلامییدا هەرچەند دەکەن سەقامگیر نابن!

جا ئەوانەی کە لە ئیسلامدا نەشارەزاو پێی نائاشنان گلەیی لە خەڵك دەکەن و دەڵێن: ئەو خەڵك و جەماوەرەی ئێمە هەر چەند دەکەین عەلمانییەت قبووڵ ناکات! نەخێر لە راستیدا ئەو فیکرەو بیردۆزانە جێگەو پێگەیان نیە لە نێو ئێمەی مسوڵمان و وڵاتانی ئیسلامییدا، چونکە مسوڵمانان پێویستییان بەو شتانە نییە، ئاخر مسوڵمانان دینەکەیان وەك دینی شێوێنراوی مەسیح (علیەالسلام) ڕێگەی زانست و زانیاری لێ نەگرتوون تا دەستبەرداری بن، وە ڕێگەی ماف و ئازادییەکانی لێ نەگرتوون، وە ڕێگەی چاکەکاریی و دادگەریی لێ نەگرتوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە دینەکەیان فەرمان دەکات بە زانیاری و

دادگەریی، وە فەرمان دەکات بەوە کە چەوساوەو ژێر دەستەکان ئازاد بکرێن، وە دینەکەیان دژی داگیرکەران و دیکتاتۆران و خۆسەپێنەرانەو هاتوە تاکو خۆشبەختیان بکات و وڵاتیان ئاوەدان بکاتەوە، وە دینەکەیان لەگەڵ پێشکەوتن و چاککردن و گەشەپێدانی ژیان دایە، کەواتە مسوڵمانان خۆیان ناچار نابینن کە دەستبەرداری دینەکەیان بن، هەڵبەتە مسوڵمانانێك کە بە دینەکەیان شارەزاو ئاشنابن، بۆیە دەبینین کەسانێك لە دینەکەیان پاشگەزدەبنەوە کە لێی بێئاگاو پێی نەشارەزان، بەڵام کەسانێك کە لە دینەکەیان شارەزان و تێی دەگەن و دەبینن رێی هیچ شتێکی باشیان لێ ناگرێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە رێگەی هەموو شتێکی خراپیان لێ دەگرێ و فەرمانیان پێ دەکات بە هەموو شتێکی چاك، رۆژ بەرۆژێ لەلایان شیرینتر دەبێ و پێیەوە پابەندتر دەبن.

کەواتە مەسەلەی حوکم و سیاسەت و دارێژنی لە ئیسلام و دوورخستنەوەی لە بەرنامەو ئایینی تێرو تەواو و هەمەلایەنەی خوای بەدیهێنەر کە جیهانبینیی و بیروباوەڕ و بەندایەتیکردن و ئەخلاق و ئەدەبە، ئنجا لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووریی و...هتد، دارێژنی حوکم و سیاسەت لێی بریتیە لە لەتکردنی دین و بەش بەشکردنی خودی دین، چونکە سیاسەت بەشێکە لە دین، سەرپەرشتیکردن و مشوورخواردن لە ژیانی خەڵك بەشێکە لە دینەکەیان و بەشێکە ئیسلام، کەواتە کاتێك دەگوترێ: با سیاسەت لە ئیسلام یان ئیسلام لە سیاسەت دوور بخرێتەوە، یان دین لە دەوڵەت دابڕنرێ، واتە با ئیسلام لەت بکرێ و بەش بەشبکرێ، خوای پەروەردگاریش بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ

فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ....﴾ (الأنعام-159)

واتە: بێگومان ئەوانەی کە دینەکەی خۆیانیان پارچەپارچە کردوەو بوونەتە دەستە دەستە تۆ هیچ پەیوەندیت پێیانەوە نیە... .

واتە کەسانێك کە ئیسلام بەش بەش دەکەن و دە ڵێن: عیبادەتە کەی دەگرین بەڵام سیاسەتەکەیمان ناوێ، یان لایەنی پەروەردەیی یەکەی دەگرین بەڵام جەنگ و جیهادەکەیمان ناوێ، یان لا یەنی کۆمەلا یەتی یە کەی دەگرین، بەڵام لایەنی عیبادەتمان ناوێ، ئەوانەی وادەڵێن خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەی محمد ﷺ ئەوا نە هیچ پەیوە ندیان بەتۆوە نەماوە، مە سوڵمانانێك پەیوە ندییان بە (محمد المصطفى)وە ﷺ هە یەو مسوڵمانانێك ئوممەتی ئەون، کە ئەو ئیسلامەی خوا ناردوو یەتی بە هەموو لایەنەکانییەوە قبووڵیان بێ، وەك چۆن عیبادەتەکەیان قبوو ڵە، حوکم و سیاسەتەکەشیان قبووڵ بێ، وەك چۆن لایەنی ئەخلاقییە کەییان قبووڵە، لایەنی ئابوورییەکەیشیان قبووڵ بێ و هەموو لایە نەکانی دیکەی ئیسلامیشیان قبووڵ بێ، چونکە ئینسان ئەگەر خۆی بە بە ندەی خوا زانی مافی ئەوەی نیە بڵێ خوا یە ئەوەت لـێ وەردە گرم، بەڵام ئەوەیانت لـێ وەرناگرم، خوایە فلان لایەن لە دینەکەت بە کەڵك دێ، بەڵام فلان شتەی دیکەیانت بەکەڵك نایەت!!! بەڵکو خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ؟!﴾ (البقرة-85)، واتە: ئایا بڕواتان بە هەندێك لە کتێبی خوا هە یەو بێ بڕوا شن بە هەندێکی دیکەی؟!

مسوڵمان نابێ وابێ، مسوڵمان نابێ خۆی سەرپشك بکات و مافی ئەوە بەخۆی بدات کە سەرپشك بێت لە هەڵبژاردنی هەندێك لە دینی خواو ڕەفزکردنی هەندێکی دیکەیدا، بەڵکو مسوڵمان دەبێ ملکەچی هەموو بەرنامەی خوای بەدیهێنەرو کاربەجێ بێت. ئێستاش با تەماشای ئەم بەڵگانە بکەین تاکو چاکتر بۆمان دەربکەوێ کە ناگونجێ حوکم و سیاسەت لە ئیسلام دابڕنرێ:

((چەند بەڵگەیەك لەسەر لەیەك دانەبڕانی ئیسلام و سیاسەت))

یەکەم/ ئیسلام بەرنامەی ژیانە، چونکە خوای کاربەجێ ناوی لە ئیسلام ناوە (دین) دەفەرموێ: ﴿ورضيت لكم الأسلام ديناً﴾ (المائدة-3) واتە: وە ئیسلامم بۆ بەدین پەسند کردوون. وشەی (دین)یش لە زمانی عەرەبیداو لە بەکارهێنانی قورئاندا بە چوار (4) واتا هاتوە:

1- سزاوپاداشت [26].
2- ملکەچیی و خۆ بەدەستەوەدان [27].
3- بەرنامەی ژیان بە گشتی[28].

(26) وەك: ﴿ مالك يوم الدين ﴾ (الفاتحة-4).
(27) وەك: ﴿..ألا لله الدين الخالص ﴾ (الزمر-3).
(28) وەك: ﴿ ماكان ليأخذ أخاه في دين الملك.. ﴾ (يوسف-76)، ﴿....لكم دينكم ولي دين﴾ (الكافرون-6)

4- وە بە مانای (ئیسلام)[29]یش هاتوە كە بەرنامەی خوایە بۆ ژیانی ئینسان، لەم ئایەتەشدا دەفەرموێ: ئیسلامم بەبەرنامەی ژیان بۆ پەسندكردوون ﴿ورضيت لكم الأسلام ديناً﴾ (المائدة-3) ، جا ئیسلام كە بەرنامەی ژیان بێت، دیارە بەرنامەی ژیان ناگونجێ باسی سیاسەت و حوكمڕانی تێدا نەبێت و ناگونجێ باسی قەوارەی سیاسی تێدا نەبێت، ئاخر ئەوە چ بەرنامەیەكە ئەوەی تێدا نەبێ كە چۆن سەرپەرشتی ژیان و گوزەران و كاروباری خەڵك و كۆمەڵگا و وڵات بكرێ؟! بێگومان ئەوە بەرنامەیەكی ناتەواوەو خوای كاربەجێش دەفەرموێ: ئەم ئیسلامەی ئێوە بەرنامەیەكی تێرو تەواوە ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ..﴾ (المائدة-3) واتە: ئەمڕۆ بەرنامەكەتانم بۆ تەواو كردوون. ئیسلام كە بەرنامەیەكی تەواو بێ، بە تەئكید دەبێ بەشێك لەو بەرنامە تێروتەواوە بریتی بێ لە مەسەلەی سیاسەت و حوكمڕانیی، وە چۆنیەتی دروستكردن و پێكهێنانی قەوارەی سیاسی، وە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی وڵات وكۆمەڵگا.

دووەم/ حاكمێتی خوای بەرزومەزن بەشێكە لە پەروەردگاریێتی خوا، وە جۆرێكیشە لە پەرستراوێتی خوا.

خوای بەدیهێنەر پەروەردگاری خەڵكە، هەركەسێك كە ئیمانی بە ئیسلام بێت و خۆی بە مسوڵمان بزانێ دیارە دەڵێ: پەروەردگارم خوا(الله)یە، وەك خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ

---

(29) وەك: ﴿إن الدين عندالله الاسلام...﴾ (آل عمران-19)

وَالأَرْضِ؟! قُلِ اللّهُ﴾ (الرعد-16) واتە: ئەی محمد ﷺ لێیان بپرسە کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە؟! -پاشان هەرخۆی شی وەڵامە کە فێری پێغەمبەر دەکات و دەفەرموێ- تۆ بڵــێ: خوا.

بەڵێ بەس خوا (الله) پەروەردگارە، پەروەردگاریش واتە: سەرپەرشتیار، بەڕێوەبەر، سەییدو سەروەر، خاوەن، پەرستراو، و شەی (ربّ) ئەو واتایانە هەموویان دەگە یەنێ، کەوا تە کێ گەورەو سەرپەرشتیارو خاوەن و بەڕێوەبەری ئێمەیە؟ خوا (عزّو جل)، دە چا حاکمیەتی خوا، واتە ئەوە کەدەبێ خوا حاکم بێ لە ژیانی ئێمەدا ئەو بەرنامەمان بۆ دابنێ و حەڵاڵ و حەرامان بۆ دیاری ب کات، ئا ئەوە بەشێکە لە پەروەردگارێتی خوا، ئەگەر خوا پەروەردگاری ئێ مە بێ دەبێ حاکم و بەرنامە ر ێژی ئێ مەش بێ، چونکە بە شێك لە پەروەردگارێتی خواو سەرپەرشتیکردنی بۆ ژیانی ئێمەو خاوەندارێتی بۆ ئێمە ئەوەیە کە حەڵاڵ و حەرامان بۆ د یاری ب کات و چاکەو خراپەمان بۆ دەستنیشان بکات لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لە بواری سیاسی، ئ یداری، ئابووری، کۆمەڵا یەتی، فی کری، ئەخلاقی، عیبادییدا، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دە فەرموێ: ((ا لحلال بیّن والحرام بیّن)) (رواه البخاري ومسلم)، واتە: لە بەرنا مەی خوای پەروەردگاردا حەڵاڵ و حەرام هەردووکیان ئاشکراو روونن.

بەڵێ بەرنامەی خوای کاربەجێ هەموو حەڵا ڵە سەرەکییەکان و حەرامە سەرەکییەکانی دیاری و دەستنیشان کردوون.

هەروەها خوای بێهاوتا لە سوورەتی (یوسف)دا لە سەر زمانی (یوسف) پێغەمبەر (علیه السلام) سێ وشەی وەك و شەی هاوواتا (مُترادف) بەکارهێناون ئەوانیش بریتین لەو شەکانی ( حوکم، عیبادەت، دین)، یوسف (علیه السلام) لە کاتێکدا قسە دەکات لەگەڵ دوو هاوەڵە زیندانییەکانیدا دەفەرموێ: ﴿...إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (یوسف-40)، واتە: حوکم تەنیا هی خوایە، حوکم لێرەدا بە مانای بەرنامەدانان و یاسادانان (تشریع) دێت، دیاریکردنی حەڵاڵ و حەرام (ان الحکم الا لله) واتە: حوکم مافی هیچ کەس نیە بێجگە لە خوا، بەرنامەو یاسادانان بۆ ئینسانەکان تەنیا مافی خاوەن و پەروەردگارو بەدیهێنەری ئینسانەکانە کە خوایە، ﴿أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ خوا فەرمانی کردوە کە جگە لەو کەسی دیکەو هیچ شتێکی دیکە نەپەرستن، واتە: تەنیا کاتێك بەندایەتیتان بۆ خوا یەکلا دەکەنەوەو تەنیا کاتێك بەس خوا پەرست دەبن، کە تەنیا حوکم و بەرنامەی خوا لە ژیانی خۆتاندا پیادە بکەن، دوایی دە فەرموێ: ﴿ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ ئائەوە دین و بەرنامەی راستە، کە تەنیا خوای پەروەردگار حاکم و بەرنامە دانەر بێ، وە تەنیا خوای بەدیهێنەر پەرستراو بێ، تەنیا هەر ئەو پەرستراوتان بێ و ملکەچیی و فەرمانبەریی بۆ بکەن بە شێوەیەکی رەها، ئائەوە دینی راستە.

سێیەم/ بۆیە ناگونجێ حوکم و سیاسەت لە ئیسلام دابڕێنرێ چونکە، ئیسلام بەبێ قەوارەی سیاسی بەڕێوەناچێ.

ئیسلام ناگونجێ وەك سیستەم و بەرنامەی ژیان بەڕێوەببرێ بێ ئەوەی دەسەڵات و قەوارەی سییاسی هەبێت، با سەرنج بدەین و بزانین چۆن؟!

جارێ ئەگەر تەماشای مێژوو (سیرة)ی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بکەین دەبینین پێغەمبەرمان ئەو کاتەی کە لە مەککەش بووە، کە خۆی و هاوەڵە بەڕێزەکانی چەوسێنراوەش بوون لە لایەن زلەزلەکانی قوڕەیشەوە، لەبەرئەوە بوو کە دەیفەرموو: دەبێ تەنیا خوا پەرستراو بێو (لا اله الا الله) جگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نین، ئێستاش زۆر کەس کە تەماشای مێژووی پێغەمبەر ﷺ دەکاتەوە وادەزانێ کە زلەزلەکانی قوڕەیش و سەرانی شیرك و کوفر لە خۆشەویستی بتەکان بووە کە دژایەتی پێغەمبەریان کردوە ﷺ، نەخێر، زۆربەیان زانیویانە بتەکان هیچ نین، بەڵکو لە خۆشەویستی بەرژەوەندییەکانیان بووەو زانیویانە کە ئەگەر (لا اله الا الله) بکرێتە بەرنامەی ژیان خەڵك چی دیکە (ابوجهل، ابوسفیان، ولیدبن المغیرة، نضربن الحارث...) ئەو زلەزلانە ناپەرستن، کە خۆیان لە خەڵك کردبوو بە پەروەردگارو پەرستراو و خەڵکیان بە کۆیلەو ژێردەستی خۆیان دەزانی، چونکە (لا اله الا الله) پێش ئەوەی بریتی بێ لەوە کە جگە لە خوا لە کەسی دیکە مەپاڕێنەوەو سوێند بە کەسی دیکە

مەخۆن و هیچ کەسێك و هیچ شتێکی دیکەتان لەو زیاتر خۆش نەوێ، پێش ئەوە بریتیە لەوە کە جگە لە خوا ملکەچی کەسی دیکە مەبن و فەرمانبەریی کەسی دیکە مەکەن، چونکە لە خوا پاڕانەوەش هەر ملکەچییە بۆ خوا (سبحانە وتعالی)، سوێند بە خوا خواردنیش هەر ملکەچییە بۆ خوا (تبارك وتعالی)، کەوا تە لە ڕاستیدا (لا الە الا اللە) یانی: نابێ هیچ کەس بەندایەتی بۆ بکرێ و ملکەچی بۆ بکرێ و ئەوپەڕی خۆشویستن و بەگەورەگرتن و ملکەچی بۆ بڕیار بدرێ بێجگە لە خوا (عزّوجل)، کەواتە هەرچی طاغوت و فیرعەون و دیکتاتۆرە دەبێ بازاڕی خۆی بپێچێتەوەو هیچیان شەرعیەتیان نامێنێ کە بڵێن: ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾ (النازعات–24). واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، وەك کە فیرعەون دەیگوت، یان وەك نەمروود کە دەیگوت: ﴿أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ﴾ (البقرة–258) واتە: من ژیان ومردنی خەڵکم بەدەستە، یان وەك ئەبووجەهل کە دەیگوت: دەبێ من حەڵاڵ و حەرام دیاری بکەم و ئەمرو نەهی بەسەر خەڵکدا بکەم، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو (لا الە الا اللە) واتە: هەموو ئەو ڕژێم و دیکتاتۆرانەی کە هەواو ئارەزووەکانی خۆیانیان لە خەڵك کردۆتە بەرنامەی ژیان، هەروەها هەموو ئەو سیستەم و بەرنامانەی کە تەنیا لە خزمەتی بەرژەوەندیی طاغوت و دیکتاتۆرەکان دان و لە دژی خەڵك و جەماوەری چەوساوەن، دەبێ هەموو ئەوانە بازاڕی خۆیان بپێچنەوە، دیارە بۆیەش هەر ئەوانە بوون

كە لەگەڵ پێغەمبەرانی خوادا (علیهم الصلاة والسلام) تێكدەگیران، دەبینین هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە كە دیكتاتۆر و فیرعەونێك یەخەی پێ نەگرتبێ، ئەوە مووسایە فیرعەون یەخەی پێ دەگرێ، ئەوە ئیبراهیمەو نەمروود ڕێگەی پێ دەگرێ، ئەوە موحەممەدە ﷺ و ئەبووجەهل شەڕی پێ دەفرۆشێ، ئەوە هەموو پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام) كە دیكتاتۆرو زلەزلەكان ڕێگەیان پێدەگرن.

جا بۆیە من زۆر بەجێگەی داخی دەزانم كە وابزانرێ ئیسلام لە خزمەتی زاڵم و ستەمكارو دیكتاتۆرەكان دایەو لە زەرەو زیانی خەڵكی چەوساوەو ڕەشوڕووتە!! لەكاتێكدا بەدرێژایی مێژوو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) مەشخەڵ هەڵگری ئازادیی بوون و بانگی ئازادیی و ڕزگارییان بەگوێی خەڵكدا داوە، وە پێغەمبەران هەمیشە شوێنكەوتووەكانیان بریتی بوون لە: چەوساوەكان (مستضعفین)، دوژمنانی پێغەمبەرانیش هەمیشە بریتی بوون لە: خۆبەزلگرەكان، خۆشگوزەرانەكان، زیادەڕۆییكەرەكان (المستكبرین، المترفین، المسرفین) ئائەوانە دوژمنەكانیان بوون و شوێكەوتوانیشیان ڕەشوڕووت و چەوساوەو صاف خوراو و بەش خوراوەكان بوون.

ئنجا ئایا بۆچی خەڵكی چەوساوەو ستەمدیدە شوێن بانگی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) كەوتوون؟!! چونكە:

1- بەرژەوەندیی ناشەرعیی ڕێگەی لێ نەگرتوون.

2- بەختەوەریی دنیاو دوارِۆژی خۆیان لە پەیامی پێغەمبەراندا بینیوەتەوە.

خۆبەزلگرو دیكتاتۆرو طاغوو تەكانیش بۆیە دژی پێغەمبەران بوون، چونكە ئەگەر پەیامی پێغەمبەران بچەسپێ و تەنها خوا پەرستراو بێ، فیرعەون رێگەی پەروەردگاریتی بەسەر خەڵكەوە نامێنێ و بۆی ناكرێ بڵێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي ...﴾ (القصص-38)، واتە: ئەی دەستو پێوەندەكەم جگە لە خۆم پێم شك نایە پەرستراوێكی دیكەتان هەبێ و دەبێ هەر من بپەرستن و بەندایەتیم بۆ بكەن! بەڵێ جا ئەگەر پەیامی پێغەمبەران بچەسپێ و تەنیا هەر خوا پەرستراو بێ، فیرعەونی ئەوكات و فیرعەونەكانی هاوچەرخیش رێگەیان نامێنێ بڵێن: خەڵكینە دەبێ بمانپەرستن و بەندەو كۆیلەی ئێمەبن، بەڵكو خەڵك لێیان رادەپەڕن و پێیان دەڵێن، ئێوەش وەك ئێمە هەر بەندەو دروستكراوی خوان.

چـوارەم/ ئنجا با سەرنج بدەین دا خۆكییان و قەوارەی ئیسلامیی ئامانجی چیەو ئیسلام چی دەوێ كە دەبێ دەسەڵات بەدەستی كەسانێكەوە بێت كە هەڵگری شەریعەتی خوان:

1- خوای دادگەر دەفەرموێ: یەكەمین شتێك كە من هەموو پێغەمبەرانی خۆمم لەو پێناوەدا ناردووە بریتیە لە چەسپاندی دادگەریی، لەو بارەوە ئەو ئایەتە زۆر جێگەی سەرنجە كە خوای پەروەگار دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ

الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ..﴾ (الحديد-25)، واتە: ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان (عليهم الصلاة والسلام) بە بەڵگەی ئاشکراوە ناردوون، وە کتێب و تەرازومان پێدانااردوون، (کتاب) واتە: بەرنامەی ژیان، تەرازوو (میزان)یش واتە: ئامرازی چەسپاندنی داد گەریی، چا خوای پەروەدگار دەفەرموێ: پێغەمبەرانمان هەموو بۆ چی ناردوون و کتێب و تەرازومان بۆچی پێدا ناردوون؟ ﴿لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴾ بۆ ئەوەی خەڵك بەدادگەری بەڕێوەبچێت.

کەواتە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هەموویان بۆ ئەوە هاتوون دادگەریی (عدل) بچەسپێنن، چا لێرەدا و شەی (القسط) لە ئایەتەکەدا (أل)ی لەسەرە واتە هەموو جۆرەکانی (عدل)، دادگەریی لە رووی ئابووری کە چینایەتیی و قرِ ییی و پڕیی نەبێت، دادگەریی لە رووی سیاسی کە چەوساندنەوەو زاڵم و مەزڵومیی نەبێت، دادگەریی لە ڕووی نەتەوا یەتی کە هیچ نەتەوەیەك نەتەوەیەکی دیکە نەچەوسێنێتەوە، دادگەریی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە واتە هیچ کەسێك نەڵێ: من هەر بەوەجاخ و رەچەڵەك لە فلان کەس گەورەترو رِە سەنترم و ئەو لە خوار منەوەیە، بەڵــێ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هەموویان بۆ چەسپاندنی داد گەریی نێردراون، بەتەنێ یدیش داد گەری ناچەسپێ تا هێز و دەسەڵاتی سیاسی دە ستەبەر نەبێت، بۆ یە خوای زاناوشارەزا لەو ئایەتەدا کە ئاماژەمان پێکرد دوای ئەوەی

کە دەفەرمویّ: ﴿لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ یەک سەر دوای ئەوە دەفەرمویّ: ﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ..﴾واتە: ئاسنیشمان ناردۆتە خوارێ کە هەم هێزو دەسەلاّت و هەم سوودو کەلّکیشی تیّدایە بۆ خەلّك، کە ئەوە ئاماژەیە بە تەکنۆلۆژیای سەربازی و مەدەنی، چونکە ماددەی سەرەکی تەکنۆلۆژیا بریتییە لە ئاسن، واتە ئەو بەرێوەبردن و چەسپاندنی داد گەرییە پێویستی بە هێز ( قوة) هەیە کە بە زاراوی ئەمرۆ لە تەکنۆلۆژیای سەربازیی و مەدەنییدا خۆی دەبینێتەوە.

2- یەکێکی دیکە لە ئەرکەکانی کیان و قەوارەی ئیسلامی بریتییە لە: پاراستنی ژیانی خەلّك، هێمنی و ئاسایشی خەلّك، وە چە (نسل)ی خەلّك، ئابروو و کەرامەتی خەلّك، مالّ و سامانی خەلّك.[30]

بەلّێ بەرێزان !

**لە قورئاندا خوای کاربەجێ پێنج (5) جۆرە سزای دیاری کردوون:**

أ) دەفەرمویّ: هەرکەسێك کە کەسێك بکوژێ دەبێ بکوژرێتەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ..﴾ (البقرة–178) دواتر دەفەرمویّ: ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (البقرة–179)

30 ) ئەم مەسەلەیە پێشتریش باسکرا، بەلاّم بە کورتی و بە بۆنەیەکی دیکەی جیاوازەوە.

تۆڵە (قصاص)- واتە: كوشتنەوەی كەسێك كە بە ناحەق خەڵك دەكوژێ و دەستی دەچێتە خوێنی خەڵك- یەكێكە لە سزا ئیسلامییەكان تاكو ژیانی خەڵك پارێزراو بێت.

ب) خوای دادگەر چوار (4) جۆرە سزای دیاریكردوون بۆ هەركەسێك كە خەڵك دەترسێنێ و ڕێگریی دەكات و هەڵدەكوتێتە سەر ماڵ و حاڵیان، هێمنی و ئاسایشیان تێكدەدات، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (المائدة-33) ، واتە: بێگومان سزای ئەو كەسانە كە دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەن وە پەشێوی و ئاڵۆزیی و نائارامیی لە وڵاتدا بڵاودەكەنەوە ئاوایە: ئەگەر خەڵكیان كوشتبوو دەكوژرێنەوە، وە ئەگەر خەڵكیشیان كوشتبوو و ماڵیشیان لە خەڵك ستاندبوو وێڕای كوژران هەڵیش دەواسرێن، وە ئەگەر خەڵكیان نەكوشتبوو بەڵكو هەر ماڵیان لێ ستاندبوون ئەوە دەستی ڕاست و پێی چەپیان دەبڕدرێ، وە ئەگەر بە تەنیا خەڵكیان ترساندبوو ئەوە دەردەكرێن و دووردەخرێنەوە[31] سەرنج دەدەین لێرەدا خوای دادگەر تێكدانی هێمنیی و ئاسایشی خەڵك و وڵات، بە دژایەتی خۆی و پێغەمبەرەكەی ﷺ لەقەڵەم دەدات،

(31) ئەم تەفسیرە ڕای زۆر بەی توێژەرەوان و شەرعزانانی لە سەرە لە گەڵ هەندێك وردە جیاوازیی دا.

کەچی ئێستا تۆمەت بۆ ئەهلی ئیسلام و تەوژمی ئیسلامیی دەکرێت کە ئیسلامییەکان هێمنی ئاسایشی وڵات تێکدەدەن و خوێن دەڕێژن و ئاواوئاوا دەکەن، بەڵام خوای کاربەجێ لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە بۆخۆی فەرمایشتی کردوە بڕیاری دەرکردوە بۆ پارێزگاری لێکردنی هێمنی و ئاسایش و ئارامی خەڵك و وڵات، دەفەرموێ: هەرکەسێك هێمنی و ئاسایشی خەڵك و وڵات تێکبدات و ئاشووب و ئاژاوە بنێتەوە، ئەوە دژایەتی خوا و پێغەمبەری خوای کردوە، وە بەپێی جۆری تاوانەکەی ئەو چوار جۆرە سزایەی دیاری کردون کە باس کراون.

ج) وە بۆ چۆنیەتی سزادانی هەرکەسێك کە بیەوێ داوێن پیسی بکات و وەچە(نسل)ی خەڵك تێکەڵ بکات، وە دەستدرێژیی بکاتە سەر ناموسیان خوای کاربەجێ دەفەموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلدة...﴾ (النور-2) واتە: ئافرەتی داوێن پیس (زیناکەر) و پیاوی داوێن پیس (زیناکەر) هەرکامێکیان یەکی سەد(100) قامچییان لێبدەن. کە زۆربەی زانایان و توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێرەدا مەبەست کچ و کوڕی زیناکەرن، ئەگەرنا ئافرەت کە شووی کردبێ و پیاو کە ژنی هێنابێ ئەگەر زینا بکەن سزاکەیان لەوە قورسترەو دەبێ بکوژرێن بە شێوەی بەردباران کردن[32] ئەوەش لە پێناوی ئەوەدا کە وەچەی

(32) هەرچەندە من لەوبارەوە رایەکی دیکەم هەیەو پوختەکەی ئەوەیە کە بەردباران (رجم) کرانی ژن و پیاوی زیناکەر یان نەسخ کراوەتەوە،یان لەبواری سیاسەتی شەرعیدا بووە.

خەڵك پارێزراو بێو تێکەڵ نەبێ، چونکە ئەگەر بێت و سزاو تۆڵەیەك نەبێ خەڵك دەستی دەچێتە ناموو سی خەڵك وە رابواردنی ناشەرعی و داوێن پیسی پەرەدەستێنێ و لە ئەنجامدا نازانرێ ئەو کوڕە یان ئەو کچە بابەکەی کێیە! وەك ئێستا لە رۆژئاوا منداڵی زۆڵ ئەوەندە زۆر بووە لایان بۆتە شتێکی ئاسایی کە منداڵ بابی خۆی ناناسێ، دەزانێ لە چ دایکێك بووە بەڵام باوکی ناناسێت!! جا بۆ پارێزگاریی لێکردنی وە چەی خەڵك و نەپچڕانی شیرازەی خێزان ئیسلام ئەو سزایەی داناوە کە باسمان کرد.

د) وە بۆ پارێزگاریی لێکردنی شەرەف و ئابڕوو و کەرامەتی خەڵك و بۆ ئەوەی هیچ کەس وا فێر نەبێت هەر لە خۆوە بوختانی داوێن پیسیی بەخەڵك بکات، ئیسلام سزای بوختانی داناوە کە بریتییە لە هەشتا(80) قەمچی، وەك دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (النـور-4) ، واتە: وە ئەوانەی کە بوختان دەکەن بە ئافرەتانی پاك (هەروەها پیاویش هەمان حوکمی هەیە- سزایان ئەوەیە کە هەشتا(80) قەمچییان لێبدرێت ئەگەر چوار شاهیدیان نەهێنا، وە لە دواییشدا بە فاسق لەقەڵەم دەدرێن و هەرگیز شایەدیی یان لێ وەرناگیرێت. ئەوەش سزای کەسێکە کە ئابڕووی خەڵك دەڕووشێنێ بە ناحەق.

ه) سزای کەسێکیش کە دەستدرێژی دەکاتە سەرماڵ و سامانی خەڵك ئەوەیە کە دەستی ببڕدرێ، وەك خوای داد گەر دە فەموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (المائدة-38)، هەڵبەتە دەست برینە کە لە هەموو حاڵێکدا نیە[33] بەڵکو لە حاڵێك دایە کە دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبێ و ژیان و گوزەرانی خەڵکی دابین کرد بێ، وە کەس لە برسان دزیی نەکات، واتە لەبەر ئەوپەڕی پێویستی و ناچاریی دزیی نەکات، چونکە ئیسلام دەستی خائین و ناپاك دەبڕێ نەك دەستێك کە ناچاریی ژیان و لەبرسان مردن پاڵی پێوەنابێت بۆ دزییکردن.

جا لێرەدا با تەماشا بکەین! ئایا چ کاتێك و لە چ کۆمەڵگایەکدا دەگونجێ ئەو سزایانە جێبەجێ بکرێن و بچەسپێنرێن بۆ ئەوەی ژیانی خەڵك پارێزراو بێ، ئاسایش و ئارامییان پارێزراوبێ، خێزان و وەچەیان سەلامەت بێ، وە کەرامەت و ئابروویان و ماڵ و سامانیان پارێزراو بێ؟! بێگومان کاتێك کە دەسەڵاتێکی سیاسی هەبێ، دەنا ئەگەر کیان و قەوارەو سوڵتەیەکی شەرعی نەبێ ئەو سزایانە چۆن دەچەسپێن بەسەر تاوانبارندا؟!!

(33) هەروەها جێبەجێ کردنی هەموو سزا شەرعییەکانی دیکەش پەیوەستە بە هەبوونی دەسەڵات و کیانێکی شەرعییەوەو، رەخسانی هەلو مەرجی گونجاویش، بە مەرج گیراوە!

پێنجەم/ پاشان دەڵێین: بەبێ پابەندیی بە شەریعەتی خواوە بە هەموو لایەنەکانییەوە بەندایەتی ئینسان بۆ خوا نایەتەدی، ئێمە کە لە نوێژدا دەڵێین: ﴿ایاك نعبدُ وایاك نستعین﴾ تەنیا تۆ دەپەرستین وە تەنیا یارمەتی لە تۆ دەخوازین. ئایا چ کاتێك ئێمە تەنیا خوا دەپەرستین؟! دیارە لە کاتێکدا کە تەنیا بە پێی شەریعەتی خوا بەڕێوەبچین، چونکە پەرستن و بەندایەتی واتە ملکەچیی ڕەها (مطلق)، ئەوەش کاتێك دەبێ کە لە هەموو لایەنەکانی ژیانماندا تەنیا ملکەچی خوا بین خوای پەروەردگار فەرمانڕەواو بەرنامەدانەرمان بێ، وە هەر بیردۆزەو ڕێچکەیەکی دیکەی دەستکرد بە پووچەڵ و قرپۆك بزانین.

## تەوەرەی چوارەم:

# چەند بنەڕەتێکی گرنگی حوکم و سیاسەتی ئیسلامیی

**یەکەم: حوکمڕانی ڕەها (الحاكمية المطلقة) تەنها هی خوایە.**

خوای کاربەجێ حوکمڕانێتی بە واتای بەرنامەدانان و دیاریکردنی حەڵاڵ و حەرامی لە خۆیدا کورت هەڵێناوە، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ﴾(یوسف-40) بەرنامەدانان تەنیا هی خوایە، وە دەفەرموێ: ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾ (التين-8) ئایا خوا (جل شأنه) کاربەجێترین فەرمانڕەواو کاربەجێترین حاکم نییە؟! وە دەفەرموێ: ﴿وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾ (الكهف-26) واتە: خوای باڵادەست لە حوکم و بەرنامە دانانیدا هیچ کەس ناکاتە هاوبەش.

**دووەم: لە کیان و دەوڵەتی ئیسلامییدا دەسەڵات بەدەست خەڵکەوەیە.**

بێگومان زۆر کەس لەوەدا بەهەڵەدا چووە، هەرکە باسی حکوومەتی ئیسلامی کرا، دەڵێن: ئەوە حکوومەتی دینی و (تیۆکراسی)یە، بەڵام نەخێر، چونکە حکوومەتی تیۆکراسی حکوومەتی کڵێسایی بوو لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا کە پاپا دەیگوت: من سێبەری خوام لە سەر زەوی و پاپا هەربڕیارێکی دەرکردبایە چاوپۆشی لەوە بکە داخۆ لەگەڵ تەوڕات و

ئینجیل دەگونجێ یان نا، هەموو بڕیارێكی پاپا بە دین لە قەڵەم دەدرا، چونكە دەیگوت: من وەكیل و نوێنەری خوام لەسەر زەوی!! بەڵام لە ئیسلامدا گەورەو حاكمی مسوڵمانان نوێنەرو وەكیلی خوا نیە لە سەر زەوی، بەڵكو نوێنەرو وەكیلی مسوڵمانانە، جارێك یان (أبو مسلم الخولاني) چوو بۆ لای موعاویەی كوڕی ئەبوو سوفیان، گوتی: (السلام عليك أيها الاجير) گوتیان بلێ (أيها ألامير) ئەویش تا سێ جاران هەرگوتی (السلام عليك أيها الاجير) گوتیان بۆچی وا دەڵێی؟ گوتی: چونكە تۆ ئەی موعاویە مسوڵمانان بەكرێیان گرتووی بۆ ئەوەی دینەكەیان بەسەردا جێبەجێ بكەی و بە پێی دینەكەیان ژینەكەیان بۆ هەڵسووڕێنی.

بەڵێ لە راستیدا حوكمڕان و براگەورە لە سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی دا وەكیلی مسوڵمانانە بۆ ئەوەی دینەكەیان بەسەردا پیادە بكات، هەربۆیەش حوكمڕانی مسوڵمانان جا ناوی خەلیفەیە، ئەمیرە، سەرۆكە، سوڵتانە، هەرناوێكی هەیە دەبێ لەپێش مسوڵماناناو لە هەموو خەڵك پتر پابەندیی شەرع بێ و لە پێش هەموویان دا دەبێ سزاكانی بەسەردا بچەسپێنرێن ئەگەر هات و تووشی لادان و بێ شەرعییەك بێت.

كەواتە لە ئیسلامدا دەسەڵات بەدەست گەل و خەڵك و جەماوەرەوەیە دەبێ و بۆخۆیان كاربەدەستانی خۆیان دیاریی بكەن، بەڵگەش لە سەر ئەوە زۆرن، بۆ وێنە خوای پەروەردگار لە قورئانیدا هەموو

دواندن(خطاب)ەکان ئارستەی مسوڵمانان دەکات و دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، کەواتە کۆمەڵگاو خەڵك بە گشتی دوێندراوی خوای پەروەردگارەو هەموو ئەمرو نەهی یەکانی ئاراستەی خەڵك کراون نەك حوکمڕان چونکە کاربەدەست دیار نییەو دەبێ خەڵك دیاری بکات.

## سێیەم: خەڵك لەسەر بذچینەی ڕاوێژ (شوری) مشوورخۆر و کاربەدەستانی خۆی دیاری دەکات.

خوای بەرزو بەتوانا دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾(الشورى-38) کاروباری مسوڵمانان لەنێو خۆیاندا بە ڕاوێژە، گرنگترین کاری شیان بریتیە لە دیاریکردن و هەڵبژاردنی کاربەدەست و حوکمڕانەکانیان، ئەویش لەسەر بناغەی ئەوەی کە کامیان لێهاتوو (کفاءة)یی زیاترەو شایستەترو لێوەشاوەترە، نەك کامیان دەوڵەمەندترە یان دەسەڵاتدارترە یان کامیان سپی پێستترە! نەخێر تەنیا ئەوە لەبەرچاو دەگیرێ کە کامیان تەقواو و لێهاتووییان ئەمانەت و توانای زیاترەو چاکتر دەتوانێ شەریعەتی خوایان بەسەردا جێبەجێ بکات، وەك خوا فەرموویەتی[34]: ﴿..إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾ (القصص-26)

---

(34) وەك گوتراوە: (ان خصوص السبب لایمنع شمول المعنی) ئەگەرنا دیارە کە ئەو قسەیە هی یەکێك لە دوو کچەکەی پیاوە صاڵحەکەیە کە دوایی بووبە خەزووری مووسا (علیە السلام).

## چوارەم: یا سادانان (تشریع)ی زانا یان دە بێ لە بەر ڕۆ شنایی شـەریعەتدا و لە چوارچێـوەی شـەریعەتدا بێ.

ئەگەر هەندێك كەس بڵێن: ئێستا بەردەوام دنیا بەرەوپێش دە چێ و كۆمـەڵگا پەرەدەستێنێ و چەندان مەسەلەو بابەتی نوێ دێنە پێ شێ، ئنجا خۆ قورئان ئایەتەكانی سنووردارن، هەروەها فەرموودەكانی پێغەمبەریش ﷺ دیارە ئەو مەسەلەو بابەتە نوێیانەش لە قور ئان و فەرموودەدا حوكمیان بۆ دیاری نەكراوە، ئەدی چۆن حوك مەكانیان دەزانین؟!

لە وەڵامــدا دەڵێین:

لە ڕێگەی بیركردنەوەو كۆشش (اجتهاد)ی زانایانەوە حوكمی ئەو مەسەلە نوێیانە دەردەهێنرێن، وە لە را ستیدا دە قەكانی قور ئان و سوننەتیش زۆر فراوانن، بەڵام زانا یانیش ئیجتیهاد دە كەن و یا سا دادەنێن لەبەر رۆشنایی شەریعەتدا، وەك لەم گفتوگۆ یەی ن ێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و (معاذبن جبل)دا دەبینرێ:

كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ، (معاذبن جبل)ی ڕەوانەی لای یەمەن كرد پێی فەرموو: ((كیف تقضي أذا عرض لك القضاءُ؟ قال: أق ضي بكتاب الله، قال: فأن لم يكن في كتاب الله؟ قال: فب سنة ر سول الله، قال: فأن لم يكن في سنة رسول الله؟ قال: أجتهد رأيي ولا آلُوا، فضرب رسول الله صلى الله عليه وسلم على صدره وقال: الحمدلله و فق ر سولَ

رسول الله لما يرضي رسول الله)) (أخرجه أحمد وأبوداود والترمذي والدارمي والبيهقي وأبن سعد).

واتە: ئەگەر کێشەیەکت هاتە لا چۆن دادوەریی دەکەی؟ گوتی: بە کتێبی خوا حوکم دەکەم، فەرمووی: ئەگەر لە کتێبی خوادا حوکمەکە نەبوو؟ گوتی: بە سوننەتی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خواش دا نەبوو؟ گوتی: کۆشش دەکەم و بەڕای خۆم دادوەریی دەکەم و کەمتەرخەمیش ناکەم- لە گەیشتن بە ڕای ڕاست و دروستدا- ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لە سینەی داو فەرمووی: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕەوانەکراوی پێغەمبەری خوای سەرکەوتوو کردوە بۆ شتێك کە مایەی ڕەزامەندیی پێغەمبەری خوایە.

## پێنجەم: ئیسلام لە بوارەکانی جیهانبینی و ئیمان و عەقیدە و عیبادەت و ئەخلاقدا زۆر بە وردی نوختەی خستۆتە سەر پیت.

ئیسلام لە بوارەکانی جیهانبینی و ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و ئەخلاقدا زۆر بە وردی نوختەی خستۆتە سەر پیت، بەڵام بۆ بوارەکانی سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی و جەنگ و ئاشتی و ئەوانە زیاتر هێڵە سەرەکییەکان (خطوط عريضة)ی داناون، بۆچی؟! تاکو دەست و پێی خەڵك نەبەستێ، چونکە ژیانی ئینسان زیاتر لە ڕووە ماددییەکەیەوە بەردەوام و بەخێرایی پەرەدەستێنێ و بەرەوپێش دەچێ،

واته له ڕووی سیاسی و ئیداریی و ئابووریی و كۆمەڵایەتی و لەڕووی ژیان و گوزەرانی ماددییەوە، بەڵام له ڕووی ڕووحیی و عەقیدەیی و عیبادیی و ئەخلاقییەوە ئینسان له سەرەتاوه چۆن بووه ئێستاش هەر وایه، خوای پەروەردگار ناگۆڕێ، سروشت و فیطرەتی ئینسانیش ناگۆڕێ وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ (الروم-33) ، كەواته پەیوەندی نێوان ئینسان و خوا كه له عەقیدەو عیبادەتدا خۆی دەبینێتەوە، وه جەوهەری ئینسان كه له ئەخلاقیدا خۆی دەبینێتەوە، ئەوانه گۆڕانیان بەسەردا نایەت، بۆیه ئیسلام نوختەی لەو بوارانەدا زۆر به وردی خستۆته سەر پیت، بەڵام له بوارەكانی دیكەی سیاسەت و حوكمڕانیی و تەشكیلی دەوڵەت و بوارەكانی ئابووریی و جەنگ و ئاشتی و كۆمەڵایەتیدا، ئیسلام بۆ شاییەكی زۆری بەجێهێشتوه كه زانایان پێی دەڵێن: ناوچەی بەجێهێڵراو (منطقة العفو) یان (دائرة المباح)، بۆچی؟!! تاكو زانایان به بیركردنەوەو ڕامان و ئیجتیهادی خۆیان و بەپێی گۆڕان و بەرەوپێش چوونی ژیان و گوزەران ئەو بۆشاییانه پڕ بكەنەوە، بەڵام لەبەر ڕۆشنایی بنچینەكانی شەریعەتدا.

**شەشەم: داد گەریی لە کویّ بێ شەرعی خواش لەوێ یە، بەرژەوەندیی لە کویّ بێ شەرعی خواش لـەوێیە.**

بنەمایەکی دیکە ئەوەیە کە زانایان وەك بنچینەیەکی شەرعیی لەسەری یەك دەنگن و دەڵێن: (أینما وجد العدل فثم شرع الله) یان (أینما وجدت المصلحة فثم شرع الله) واتە: داد گەریی لەکویّ بێ شەرعی خواش لەوێیە، بەرژەوەندیی لەکویّ بێ شەرعی خواش لەوێیە.

هەندێك کەس دەپرسن:

باشە کاتێك کە ژیان بەرەوپێش دەچێ بۆ وێنە: کاتی خۆی سەیارە نەبووە، بەلاّم ئێستا ئێمە بەهۆی پەیدابوونی سەیارەوە یاسای هاتوچۆمان پێویستەو قورئان و سوننەتیش باسی یاسای هاتو چۆیان نەکردوە، هەروەها کۆمەڵێك دیاردەی دیکە پەیدابوون لە نێو کۆمەڵگادا، ئەوا نەسیستەمەکانی حوکم پێویستە ئیدارەو میکانیزمێکیان بۆ دابنێ، جا ئایا ئیسلام لەوبارەوە دەڵێ چی و ئەوشتانە چۆن چۆنی لە شەرعدا جێگایان دەبێتەوە؟!

لە وەلاّمـــدا دەڵێیـــن:

بەپێی ئەو بنچینەیەی کە گوتمان زانایان لە سەری یەك دەنگن: (أینما وجد العدل فثم شرع الله) یان (أینما وجدت المصلحة فثم شرع الله) واتە: دادگەریی لەکویّ بێ شەرعی خواش لەوێیە، بەرژەوەندیی لەکویّ بێ شەرعی خواش لەوێ یە.

بەڵێ بەپێی ئەو بنچینە شەرعییە کە وەك (الشاطبـي) دەڵێ: لە تێوەرامان ولێوردبوونەوە (استقراء)ی سەرجەم دەقەکانی شەریعەتەوە دەستگیرمان دەبێ، هەرشتێکیش ببێتە مایەی هێنانەدی بەرژەوەندیی و خێرو قازانجی خەڵکی و چەسپاندنی داد گەریی ئەوە هۆکار (وسيلة)ێکی شەرعی و پەسندە و نەك دروستە بەڵکو پێویستە وەری بگرین و بەکاری بێنین، چونکە هەرشتێك فەرزێك پەکی لەسەر بکەوێ فەرزە: (مالايتم الواجب الاّ به فهو واجبٌ)و وە هۆکارەکان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە (للوسائل حكم مقاصدها).

ئنجا زانایان دەڵێن کە دەگوترێ ئەو شتە شەرعییە یان ناشەرعییە لە بواری مامەڵەکان (معاملات)ی وەك: سیاسی و ئابووریی و ئیدارییدا گرنگ ئەوەیە لەگەڵ دەق (نص)ێکی شەرعیدا دژ نەوەستێ نەك دەقی شەرعی لەسەر هەبێ، بەڵگەش لەوبارەوە ئەوەیە کە (عومەری کوڕی خەتتاب) -خوا لێی رازی بێ- وە سەرجەم خەلیفە راشیدەکان کۆمەڵێك شتیان لەبواری ئیدارەو بەڕێوەبردندا لە دەوڵەتی فارس و رۆم وەرگرتوە، بۆ وێنە: لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکردا -خوا لێی رازی بێ- بەندیخانە ( سجن) نەبووە، بەڵام عومەر -خوا لێی رازی بێ- لە سەردەمی خۆیدا لە مەککە ماڵێکی دیاری کردو کردی بە سجن ئەوەش کاتێك کە زانی لە دەوڵەتی فارس و رۆمدا سجن هەیە، هەروەها مەسەلەی دیوانەکان (دواوين) وەك: دیوانی سەربازان(جند)و دیوانی خەراج (خراج)و دیوانی زەکات. واتە

ئەوە کە - لیستی ناوی سەربازەکان هەبێ، یان جێگای دیاری کراو و تایبەت بە کۆکردنەوەی زەکات و باج و خەراج هەبێ- لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئەوە نەبوو، بەڵام عومەر خوا -لێی ڕازی بێ- داینان، هەروەها پۆستەو گەیاندن پێشتر نەبوو، بەڵام عومەر دایمەزراند، وە هەروەها دواتر دەوڵەتی ئیسلامیی بە پێی گەشەکردن و بەرەوپێش چوونی زیاتر، کە لە گەل و نەتەوە جۆراو جۆرەکان هاتوونە ژێر سایەی، ئیدارياتی خۆی فراوانتر کردوە بە سوودوەرگرتن لە ئەزموونی دەوڵەتانی دیکە.

زۆر کەس وا دەزانێ کە دەبێ یاسای هاتوچۆش لە قورئاندا هەبێ!! نەخێر ئەوە پێویستی بە دەقی شەرعیی ناکات، چونکە ئەوە پەیوەندی بە لایەنی هونەریی و ئەزموونی بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانەوە هەیە، گرنگ ئەوەیە لەگەڵ دەقێکی شەرعییدا تێك نەگیرێت.

**حەوتەم: لە شەریعەتی ئیسلامییدا هەرشتێك سوودی هەبێ بۆ خەڵك لە هەر کەسێکەوە بێت وەردەگیرێت.**

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((الحكمة ضالة المؤمن فحيثما وجدها فهو أحق بها)) (رواه الترمذي)، واتە: حیکمەت و شتی بەسوود شتێکە لە ئینسانی بڕوادار بزربووە، لە هەر شوێنێك بیدۆزێتەوە لە هەموو کەس پێی شایستەترەو لە هەموو کەس زیاتر حەقی پێوەیەتی، واتە مسوڵمان ڕێگەی لێ نەگیراوە، کە سوود وەرگرێ لە ئەزموونی

خەڵك، بۆ وێنە: ئێستا لەو وڵاتانە کە خەڵکی مسوڵمانیان تێدایە بەڵام کۆمەڵێك رژێمی طاغووتی حوکمیان بەسەردا دەکەن کە بەداخەوە زۆر کەس بە دەوڵەتانی ئیسلامیی ناویان دەبەن لەنێو ئەواندا دەوڵەتە عەرەبییەکان، کە ئەوانە دەوڵەتی ئیسلامیی نین بەڵکو دەوڵەتی مسوڵمان نشینن، دەوڵەتی ئیسلامی دەوڵەتێکە کە کاربەدەستەکەی مسوڵمانان هەڵیان بژارد بن بە راوێژ و پرس و را، پاشان ئەو کاربەدەستە شەریعەتی خوا پیادە بکات و لە پێش هەموو خەڵکیشدا مل کەچ بێ بۆ شەریعەتی خوا، وە لەبەردەستی خەڵك و میللەتیش دابێ و هەرکاتێك بڵێن: وەرە خوارێ یەکسەر بێتە خوارێ، جا ئێستا لەو وڵاتە مسوڵمان نشینانەدا دەبینین مەسەلەی دەستاو دەست پێکردنی دەسەڵات لە سەداسەد پێچەوانەی شەرعە، چونکە کابرا بە شێوەیەکی دیکتاتۆریی وەك (صدام حسین)ی زاڵم، جڵەوی حوکمڕانی دەگرێتە دەست و خۆی بەسەر گەل و وڵاتدا دەسەپێنێ، هەڵبژاردنی ساختەش بەرپا دەکات و بەڕێژەی (99,9%) ش بەدەست دەهێنێ، ئەوە لە حاڵێکدا، کە مەگەر دەست و پێوەندە کاسەلێسەکانیان، ئەگەرنا هیچ کەسیش نایەوێن! کە چی وای پیشان دەدەن کە تێکڕای خەڵك و جەماوەر لەگەڵیاندایە، تەماشا دەکەین هەتا دەمرن لە سەر کورسییەکەی خۆیان دەمێننەوە، یان تا کودەتایەکی سەربازیان بەسەردا دەکرێ!

بەڵام دەبینین لە وڵاتانی ڕۆژئاوا کە ئێرە مسوڵمان نشینن و ئەویش کافرنشین، بەڵام میکانیزمێکی زۆر چاکیان داناوە کابرا چوار یان پێنج ساڵ سەرۆك کۆمار یان سەرۆك وەزیران دەبێ، خولێك یان دوون یان سێیان کە خەڵکەکە لە دەستووردا لەسەری پێکهاتوون کاتێك کابرا کاتی دیاریکراوی خۆی تەواوکرد، دێتە خوارێ بە لەباری و یەکێکی دیکە لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە جێگەی دەگرێتەوە.

جا ئەوەی ئەوان دەیکەن شتێکی ڕەوایەو و شتی چاك هەر کە سێك بیکات هەر چاکە، جاری وایە کەسێك یان گەل و نەتەوەیەك بێ بڕوایە بەڵام خەسڵەتێکی باش و پەسندو مسوڵمانانەی تێدا یە، جاری واش هەیە کەسێك یان گەلێك مسوڵمان یان بەناو مسوڵمانە، بەڵام خەسڵەت و سیفەتێکی یان زیاتری کافرانەو بێ بڕوایانەی تێدا یە، ئیدی مەرج نیە هەرکە سێك خۆی بە مسوڵمان زانی هەموو سیفەتەکانی وەك ئیسلام دەڵێ وابن، وە مەرج نیە هەرکە سێکیش کافر بوو هەموو سیفەتەکانی کافرانە بن، لە ڕۆژئاوا کە ڕای خەڵك حیسابی بۆ دەکرێ و جەماوەر ڕێزی لێ دەگیرێ، ئەوە بێگومان لە ئیسلامیشدا وایە، هەموو بانگەوازەکانی قورئان دەفەرموون: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، يَا أَيُّهَا النَّاسُ ، يَا بَنِي آدَمَ) واتە: ئەی خەڵکینە، ئەی مرۆڤـــە، ئەی وەچەی ئادەم! ئەوە بۆ هەموو خەڵك بەگشتی کە هەموو خەڵك دەدوێنێ وەك یەك، پاشان دەفەرموێ: (ياايها الذين آمنوا) واتە: ئەی بڕواداران، کە ئەوانیش هەموویان وەك یەك دەدوێنێ و هەرگیز نەیفەرمووە ئەی کاربەدەستان! یان ئەی زانایان! جا کە لە ڕۆژئاوا

حیساب بۆ خەڵك و جەماوەر دە كرێ، لەرِا ستیدا ئەوە شتێكی ئیسلامییە، وە دوایی كە دەسەڵاتدار دەچێتە سەر كورسی حوكم بە ئیرادەو هەڵبژاردنی خەڵك شتێكی شەرعیی و ئیسلامییە، لێرەش كە خۆی دە سەپێنێ شتێكی كافرانە یەو دیكتاتۆرانە یەو هیچ پەیوەندییەكی بە ئیسلامەوە نیە، بەڵێ لە نێو مسوڵمانان دایەو رەنگە كابرا خۆیشی بە مسوڵمان بزانێ، بەڵام بەرِاستی چوونە سەر كور سی حوكمەكەی و شێوەی حوكمرِانییەكەی و مانەوەی لەسەر حوكم هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نیە!!

كەواتە هەرشتێكی بەسوود جا چ لەرِووی سیاسی و حوكمرِانیی، چ لە رِووی ئیداریی، چ لە رِووی ئابووریی، چ لە رِووی فەرهەنگی، چ لە رِووی كۆمەڵایەتییەوە بێ هەرشتێك باش و بە كەڵك و سوودبێ، بێگو مان ئیسلام پێشوازیی لــێدەكات، وە هیچ شتێكی بەسوودیش نیە لە هیچ كام لەبوارەكانی ژیاندا كە لەگەڵ هیچ ئایەتێكدا دژ بوەستێ، من لێرەدا رایدەگەیەنم و تەحەددا دەكەم ئەوانەی كوێرانە رِەخنە لە ئیسلام دەگرن و لە پشت پەردەی رِەشەوە سەیری دەكەن من دەڵێم با ئەوا نە بێن بزانم رِەخنەو گلەیی زانستییانە و مەنتیقییانەی لە كوێی ئیسلام هەیە!

دەبا بێن ئەدی ئەوانە ناڵێن با بە زمانی گفتوگۆ و د یالۆگ یە كدی بدوێنین! دەفەرموون با بێنە مە یدانی رِەخ نەی بابەتییا نەو شێوازی زانستییانە، بەڵام ئایا دەزانن كە شێوازی زانستییانە ئەوە یە تۆ با سی شتێك نەكەی و قسەی دەربارە نە كەی كە ئا گاداریی و ئا شنایەتیت لەگەڵێدا نەبێت؟! وە ئایا دەزانن كە رِەخ نەی با بەتیی و مەنتیقییا نە

ئەوەیە كە تۆ زاتی بەرانبەرو فیكرەكەی تێكەڵ نەكەی و لەبەرئەوەی كە ڕقت لە لایەنێكی ئیسلامیی هەڵدەستێ و بۆ خۆت عەلمانی، نە چی هەموو حەقەكانی بكەی بەناحەق، وە ناحەقییەكانی خۆیشت هەمووی بكەی بە حەق، هەر لەبەر ئەوەی تۆ دژایەتی ئیدۆلۆژیت لەگەڵیدا هەیە؟! شێوازی بابەتییانە ئەوەیە كە تۆ وەك بابەت (موضوع) ە كەی تەماشای فیكرەكە بكەی، ئیسلام وەك خۆی ببینەو كابرای ئیسلامیی لێ بەرەدەرێ، مادام ڕقت لە من هەڵدەستێ بە شەخسی زاتی من مەهێنە نێو حیسابەكەو، بەڵكو بابەتی ئیسلام تەماشا بكە بزانە ڕەخنەت لەكوێی هەیە!! ئێستا ئەوانەی بە بێئاگایی و كوێرانە بەنێو دەكەون و دەڵێن: ئیسلام بەكەڵك نایەت و لەپەنای ئیسلامدا زوڵم لە كورد كراوەو مافەكانی زەوت كراون، ئێمە دەپرسین: ئایا كێ زوڵمی كردووەو لە كوێ زوڵم كراوە؟! ئایا تۆ ڕژێمی (صدام) كە ڕژێمێكی عەلمانی و سۆشیالیزمی و شۆڤێنی بووە لە سەر ئیسلامی حیساب دەكەی؟! بەڕاستی ئەوە زوڵمێكی زۆر گەورەیە، من لە زیندانی ئەمریكییەكان بە سەرانی ڕژێمم دەگوت: ئێوە كاتی خۆی گومڕا بوون! ئایا دینی ئێوەو بەرنامەی ژیانتان و پەیڕەوی حیزبەكەتان (حیزبی بەعس) كابرایەكی گاور (میشیل عفلق) داینەنابوو! ئێوە مسوڵمانی چی بوون كە بەدوای كابرایەكی دژ بە ئیسلام كەوتبوون؟! مسوڵمانی كوێ بوون لە كاتێكدا كە سۆشیالیزمی ڕۆژهەڵات و شۆڤێنیەتی عەرەبیتان بەیەكەوە موتوربە كردبوو كردبووتان بە دینی خۆتان بەناوی (وحدة، حرية، اشتراكية)؟! ئنجا لە ڕاستیدا ئێمە سیمای (صدام

حسین)و حیزبی بەعس زۆر جوان دەکەین ئەگەر بڵێیــن: مسوڵمان بوون و ئیسلامیان بەڕێوەبردوە، وە ئیـ سلامیش نا شیرین دە کەین و زوڵمێ کی گەورەی لــێدەکەین، وە زۆر بە ناحەقیش دیفاع لە (صدام)و ڕژێمە کوفرو عەلمانییەکەی دەکەین!!

کەواتە ئەوەی ڕەخنە لە ئیسلام دەگرێ دەبێ بێتە مەیدان و بڵێ: فلان ئایەت و فلان فەرموودەیە ئاوا یە، نەك دیک تاتۆرێکی وەك ( صدام) لەسەر ئیسلام حیساب بکات، یان ئەو دیکتاتۆر و کاربەدەستانەی کە لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامییدا هەن کە بە زۆری زۆرداری خۆیان بە سەر گەلانی مسوڵماندا سەپاندوەو هیچ شتێکیان نا چێتەوە سەر شەرع، لەسەر ئیسلامیان حیساب بکەی، کە ئیسلام لە ئە سڵدا بۆ یە هاتوە دادگەریی بچەسپێنێ و ئەو جۆرە دیکتاتۆرانە لەنێو بەرێت و ئەو گەل و نەتەوە مەزڵووم و چەوساوە و ژێردەستانەی ئەوان خستوویاننە قەفە سەوە ڕزگارو دەربازیان بکات.

ئەوە کورتەیەك بوو لە ئاماژە بە هە ندێك لە ب نەماکانی حوکم و سیاسەت لە ئیسلامدا.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ان لا اله الا انت استغفرك وأتوب اليك

دەربەندیخان

2005/8/20

# نێـوەڕۆك

## ئەم نامیلکەیە

لێکۆڵینەوەیەکە لەبارەی حوکم و سیاسەتەوە لە ئیسلامداو ،چەند سەرنج و رونکردنەوەیەکی لەوبارەوە گرتونە خۆی و بە چەندان بەڵگەی بەهێز تێیدا سەلمێنراوە ،کە سیاسەت و حوکم و مشور خواردن لە کۆمەڵگاو خەڵك و سەرپەرشتی کردنی کارو باریان ، بەشێکی گرنگی ئیسلام و شەریعەتەکەی پێکدێنێ و ،بەهیچ جۆرێك ناگونجێ شەریعەت و سیاسەت لە یەك دابڕن ،ئەگەر بویسترێ ئیسلام بەو شێوەیە ، کەخوای کاربەجێ ناردویەتی و بەو جۆرەی ،کە پێغەمبەری کۆتایی (صلی الله علیه وسلم) بەرێوەی بردوە ،بناسرێ و پیادە بکرێ !

عەلی باپیر



نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: 2518138 - 2230908 - 2221695
موبایل : 07504605122 - 07701387291
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com